# کۆشیعر



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی رۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، شەقامی گوڵان، هەولێر

# کۆ شیعر

## چنار نامیق



کتێب: کۆ شیعر
نووسینی: چنار نامیق
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٥١٨
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
موتیڤ: سەربەست عومەر
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢٠٠٦
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (٧٣)ی ساڵی ٢٠٠٦ی دراوەتێ

## بەراییەک
## بۆ پاشماوەی لاپەڕەیەکی دڕاوی ڕۆژژمێرەکە

ڕۆژێکی باراناوی سەرەتای گەشتەکەمان بوو بەنێو وەردەکانی خەم و بێ ئۆقرەیی بووندا، تا بینەقاقا لە قوڕی گوناح چەقین، نەزاهەت و بەرائەتمان قوڕاوی بوو، ئەو قوڕەی نا کە ئادمی لێ دروست بوو قوڕیک بەماڵی تەنهایی ڕۆحەوە دەدرێت.

خۆرەتاو وشکمان دەکاتەوە و ڕەشەبا دەمانکاتە گەرد و تۆزو باران دەمانکاتەوە بەقوڕ.

لەم جەنگەڵە بێ مەئوایەدا درەختێک نییە سێبەر بۆ مێروولەیەکی ماندووی ژێر مەینەتی دەنکە گەنمێک چێ بکات بۆیە دەبێت سەر لەنوێ بەفرمێسک خۆمان بشۆینەوە.

# چاویلکەکانی قەدەر



لە دوا وێستگەی چاوەڕوانی
ئازارە دەستەمۆکانیش، دەخزێنە تاراوگەکانی دەروونەوە
چاویلکەکانی قەدەرم پێ خاش ناکرێت
زەمەنێ پاش خۆرەتاویش
ئەشک مەحکوومم دەکات خۆشم بوێت
دوێنێ زەمەن لاپەڕەی ڕۆژژمێرە دڕاوەکەی هەڵدایەوەو
ئاشنایی یاسەکانی کردم
لەناو چۆمی دوو چاوی مەنگی غوربەتا
لە سیمای ڕۆژگار ڕاماین و
دوندەکانی چاوەڕوانی دادەڕووخان
تیشکی ڕۆژ لە ئاسمانەکاندا کۆچی کردو
هەگبەی ئارەزووە زیندە بەچاڵەکانی
دەدایە دەستی بێداری
مانگ پەنا ئەستێرەیەکی کرد بە حەشارگە...
لانەی پەپوولەی باخچەکەمان نغرۆ کرا
دەمێ سەمای بۆ شکۆفەی گوڵێک دەکرد
شەوی یەڵدا
بە شانەی خەم پرچی ڕەشی دادەهێنا
عیشق نەبوو نە دەسرەوتین



کە عیشق هات لێی وەرس بووین
ئێمە ڕۆحێکی نامۆ بووین
لە کووچەکانی بێدەنگی چرپەی هەناسەمان دەهات
ئازارێک بووین
کەڵەگەتتر لە ئەرارات
ژان بە بەژنی خۆزگەکانماندا هەڵدەزەناو
شێرپەنجەی خەم بەناخیاندا دەگوزەرا
خەمێ بووین لەوە بالاتر
دەستی قرتاوی خۆشبەختی
بەبەژنی زراڤمان بگا و
هێشووی برینەکانمان بڕنێ
یا وەرزێک بۆ هیواکانمان پێبکەنێ و
دەستێک چاوەکانمان بسڕێ و
لە نهێنی ناخمان بگا
لەوەتەی هەین
شەوگار پەردەی ژووری تەنهاییمان هەڵدەماڵێ...و
تریفەی ئەستێرەکانمان لێ ون دەکا
لە لاشەی شەکەتی خۆمانیش بێزارین

حوزەیرانی١٩٩٩

## ئارامی کات و سەرەڕۆیی دەریاکان

بێدارتر لە ئەستێرەکان
دەڕوانمە چاوشارکێی کەون... و
ساباتە ڕووخاوەکانی بەردەرگای قەدەر
چراکان تاریکتر لە شەوگار دەسووتێن
ئارامی کات و سەرەڕۆیی دەریاکان
لە یەکتر سەرچاوە دەگرن
کاتژمێرەکان لە هێمنی چرکەکاندا
خولانەوەیان بیر دەچێ...
کەشتی ڕۆحیش لە زەریاکانی تەمەندا
لە سکوونا نوقم دەبێ...
لە گەرداوی تاریکیدا دوا تنۆکی خەمە مەستەکان دەنۆشین
گەواڵە هەورە ڕەشەکان
چاویان دەبڕن بەچاوی ساتەکانمانەوە
نیگاکانمان لێڵ دەکەن و برینێک قەتماغە ناکات...
لە تووڕەیی دەریاکان سام دەمگرێت
پرچی شەپۆڵە گومراکان
بەشانەی بێداری دابهێنم
شەوێک بەڕێکەوت مانگ هەڵدێت
ڕوخساری ڕەش دادەگەڕێ



فرمێسکە قەتیسماوەکان
لە چاوی مەنگی زەمەن دەسووڕانەوە
ئاشنایەتی کێڵگەی وشکەڵاتووی
گوڵە پەژموردەکانی حەسرەتیان نەکرد
کچێک لە شەقامەکانی کەناری ئاسوودەیی
موحیبەتی دەفرۆشت
کەس درهەمێکی نەدایە
زەمەنێ ڕاسپۆتین دێتەوەو پەیکەری عیشقی
کچە نابالغەکان
بەئاسماندا هەڵدەواسێ
کچێنەی ڕۆحی پیرۆزیان بەدەم وەنەوزی خەوەوە
لە دەست دەدا... و جەستەیان لە دار دەکێشێ
کەسیش نیشانەی پرسیارێ
بەڕوخساریەوە دیار نییە!!
پەنجەرەکان تەم گرتبوونی
به نەزانی دەرگا واڵاکانی بوونمان
بەڕووی شنە بادا داخست
دەمێ بەشوێن پێی ژوانێکی ئارامدا دەگەڕاو
کۆشی بەغوربەتا دەکرد
لەو ساتەوە
شنە تۆراو دەروازەکان داخراون
مەحاڵە گەر... بەڕوماندا بکرێنەوە
لە جۆگەلەی ژانەکاندا هێشووە خەندەمان ڕۆکرد و

فرمێسکی چاوی ڕۆژمان بۆ نەسڕایەوە
کێ لە پەنا ئەم دەڤەرە ئۆقرە دەگرێ
درەختێکی ڕووتەڵەی بەر ڕەشەباین و
یەئس لەگەڵ ڕەگەکانماندا چاندراوە
مەئیوستر لەو گوڵەی
پەپوولەکان بەفیزەوە بەسەریا دەنیشنەوە
زەمەن گاڵتە بە چارەنووسی دەکات
ئەویش دوا سرتەی تەمەنی
بەدەم گەرمەی ئازارەوە
چاوەکانی
دەبڕێتە چاوی زەمەن
بەڕابردووی پێ دەکەنێ

ئایاری ١٩٩٩



## سەفەرێک لەسەر باڵی دارشەقەکان

کاتژمێرەکان بەهەڵە چرکەکانیان بۆ ژماردین
پەریبیەکان بەبزەیەک
هێشووە خەندەکانیان ناردینە دورگەیەک
ئارامی پەی پێ نابات
لە کیشوەری دەروونمانا هیواکانیان سپاردینە دۆزەخ و
دەروازی خۆشبەختییان لێ کلۆم کردین
بەتۆمەتی عیشق مەحکوم کراین
بەر لەوەی تاریکی دا بێ چاوانیان لێو کردین لە لم
تەمەنمان سپاردە بیابان
(عاگول) میهرەبانترین شانەی کەزیمان بوو!
چ فەنابوونێکی سەیرە
ئەوکی مەعشووقەکانیان گرتین
تا کێڵگەی پەیڤە جوانەکان بتاسێنن
ئەم خاپوور کردنی وێستگەی عیشقە
نەفرەتی ڕەشەبایە
وشککردنی دەریا
گەڤکردن لە ماسییەکانە...!
ئێمەش لە سۆراخی حەزە سرکەکاندا



دوورگە دوورەکانمان تەی کرد و
لە تارمایی کەشتییەکان ڕادەماین
قەدەر بوو گوڵەکانمان ناسی
شێتانە لەسەر باڵی نەورەسەکان
بەدوی تخوبەکانی هزرو
گۆرانییەکانی منداڵیدا دەگەڕاین...
دەڕۆم و بێ ئاگا لە هەنگاوەکانم
دوێنێ بەجێ دەهێڵم و سبەینێ دەسپێرمە قەدەر
قەدەری ئەو زارۆکەی
جەنگ ئەدگاری دەشێوێنێ و
گەمەکانی بۆ دورگە تەماوییەکانی قەڵەق دەنێرێ
لە کێڵگەی کۆنترین ئازارا...بۆ ساتێ
پێڕا نەگەیشتین
لەسەر باڵی دارشەقەکانی بێ ئۆقرەیی دابەزین و
سەرخەوێک لای مەرگی ئەو گەڵایانە بشکێنین
بەر لە مەوسمی زەردبوون
هەڵوەرین

تەمووزی ١٩٩٨



## خۆر لە بێژنگی ماڵە قەرەجێکدا ئاوا بوو

لە ڕۆژێکی شڵەژاودا
شڵەژاوتر لە لاپەڕەکانی یادەوەری مێژووم
هاتمە ئەم بێشە جەنجاڵە
ئەستێرەیەک هەڵدەهات و بەدەیان مەرگ دەیبردن
لێرە تا گوڵێک دەپشکوێ
دەیان دارچناری سەوز
پرچەکانیان با دەیڕنێ
خۆر لە قوتبێکەوە هەڵدەهات و
لە بێژینگی ماڵە قەرەجێکدا ئاوا دەبوو
ڕووبارەکان هێندە تووڕە بوون
سەریان بەکەنارەکان دەکێشا...
لە زمانی گۆرانییەکان ناگەم و ئاوازەکان مەستم
دەکەن
دەمبەنە ئەو بیابانەی
تەڕی چاوی هیچ هەورێکیان نەمژیوە
سێبەری خەواڵووی درەختەکان
ئەفسانەی عیشقێکی دۆڕاویان
بۆ خۆرەتاو بەرچڤ دەکرد
ئێمەش تاڵیی پێکەکان



تنۆک تنۆک
لە لێوەکانمان چۆڕایە
سەر سفرە دڕاوەکانی قەدەر
لە مەست بوونماندا گریاین
نەماندەزانی بۆ دەگرین
چیتر ئەو سروودانە مەڵێنەوە
پەیڤەکانیان لە جەنگێکدا سەر بڕان و
ئاوازەکانیان (با) لرفی دان
پەڵە هەورەکان لە شەرماندا
ئاسمانەکانیان جێهێڵا
کاتێ نەیانتوانی ئەشک
بەسەر ئەو کێڵگانەدا بڕژێن
(پەلاس) گەرووی وشک کردن...!
ئای لە زەمەن چەند سانا دەڕوات
ژیان پشکۆیەکی ساردەو
لە هەناوی تۆپەڵە بەفرێکی گەرمدا
هەڵکورماوە
زمانەکانی عیشق و پەیڤەکانی خۆشەویستی
دەسڕێتەوە
وەک ئەو درەختە رووتەڵەی لە سایەیدا
مێروولەیەک ئۆقرە ناگرێت...

ئازاری ١٩٩٩



## دیداری ئەستێرە

کاتێ هاتی
زۆری نەمابوو مانگ هەڵبێ
دایکم بەنۆبەرە ژانی منەوە
دەتلایەوە
سەدەیەک بەر لەدایکبوونم
باوکم بەئەستێرانی ئاشنا کردم
ئەوان
بەدەستە نازدارەکانیان
بسکی شیعرە نامۆکانیان
دادەهێنام
لە ڕەحمی دایکم دەرهاتم
ژووانم لە گەڵدا بەستن
ئەوان
ڕووناکییان بەسەر
منی مەعشووق و
باوکم دادەباراند
باوکم بە شەقامەکاندا دەڕۆیشت
بە چەپکێ ڕەیحانەوە
(با) بەلەنجە باوەشێنی دەکرد



و
هاورێکانی لە ئامێزیان دەگرت
ساتێک بەر لە سەفەری ناوادەی
بڕیار بوو
هەردوو بچینە دیداری دوا ئەستێرەی تەمەن
ئەو ڕۆیشت و
لە ناوەندی ڕێگاکەدا بەجێی هێشتم
نا...بە ژوان نەگەیشتم
سەفەرێ بوو
دەریای هەردوو چاوە مەنگەکانم لیخن
لیخن بە ئەشکی بەجێماو
بەکشوەرێ برینەوە
تارایە ڕەشیان لەسەر نام
کە هاتم
خۆر دەمێک بوو ئاوا ببوو
دایکم بەژانی منەوە
دەتلایەوە

١٩٩٨



## چەپەر

سەرم جەستەم بەجێ دێڵێ و
جەستەم دووی سەرم دەکەوێ و
ناگەن بەیەک...
من نازانم،
تەرمی ژانە گڕگرتووەکانی ناخم و
گڕوگاڵی کۆرپەی حەزە شێتەکانم بۆ کوێ بەرم؟!
ئەو خەونانەی بەر لە ئێستاکە دەمبینین
نابنەوە بەهاوەدەمم
ئیدی پەنا بۆ کوێ بەرم؟!
دەڵێم مەگرە،
من دەمێکە خەونی دووری وەکو زریان
ڕێ لە هیواکانم دەگرێ و
حەزم دەستەمۆ دەکات و
شیعرە مانگرتووەکانی
ئازیزەکەم دەسووتێنێ...!
هاورێ شیعر سووتاوەکەم
دەرگاکان داخراون
لە کام پەنجەرەی گومانەوە
بێمە لات و



باسی دەیجوورت بۆ بگێڕمەوە...
شاری ئەوین دوا چەپەری ڕێگاکەم بوو
جەخار...
نە سێبەری دار بەڕوویەکم بەدی کرد
نە کانییەک
تا تینوویەتیم بشکێنێ
شنە بایەک هەڵی نەکرد
لەم وڵاتە بێ سێبەرە
گڕی سەحرا دەمسووتێنێ...

١٩٩٦



## گۆرانییەکانی دوای جەنگ

جەنگ ئەدگاری زارۆکەکان دەشێوێنێ و
دڵنیایی بۆ دوڕگە تەماوییەکانی.
قەلەق دەنێرێ...
تەمەنێکی درێژە،
کچی شیعر
کەزی سپی شەوی یەڵدای
زستانەکان شانە دەکات...
منداڵێکیش،
فەقیانەکەی دایکی بڕی
بۆ عانەیەک
پیرەژنێک
خەمەکانمانی دەڕێسا... و
سەربازێکیش،
گوێی بۆ ڕادیۆکە ڕادەگرت
جاڕی کۆتایی جەنگ درا!!
ئەی کەڵەگەتترین خەمی ساتە جوانەکان
ئەم هەوارە جێ بهێڵە
با گوڵەکان لە ئامێزی ئارامیدا
ئۆقرە بگرن



هەنگ
لە شیلەی گوڵان بمژێ
تا پاسارییە شەکەتەکان
لەسەر پووش و سوتە مەڕۆی
شەرگەکاندا نووچی بدەن
هەنگ
لە شیلەی گوڵان بمژێ
منیش
گۆرانی لەدایکبوون
بڵێمەوە

١٩٩٧



## سەمای درەختەکان

درەختی حەوشەکەمان
فێرە بالیا بوون
من کچی ئەو دوورگانە بووم
تیشکی خۆر لێی دانەدەبڕا
ساتێک سێبەر مێوانداری نەدەکردن
ناچار ڕۆحم کردە ڕەشماڵی سێبەری ئەوان
درەختی باخچەکەمان
گەڵایان کرد... بەرز بوونەوە
وەلێ... وەک تەرزی خەمانم...نا
لە حیکمەتی بێ بەریان ڕادەمام
بەر لە مێژوو
بیابان بەراو... و زستان بارانی لێ بڕا
بەبەر چاوی شەقامەوە
نێرگزیان لە سێدارە داو
پرچەکەیان دەسکەنە کرد
پەیڤە ئاڵەکانیان سەر بڕیم و
پرسەشم بۆ نەگێڕان
لەو دەمەوە
تووڕەترم لە ڕەشەبا
لەو فوراتەی ماسی بەعەشق



دەخنکێنێ و
لاشەکانیان دەبا و دەڕوات
بێ ماڵئاوا...
ئەمێستاکە
گیتاری دڵە نامۆکەم
ڕۆژی سەد ئاواز دەژەنێ
سیمام ڕەنگی ئێوارانی زەردەپەڕە
جەستەم ماندووترە
لەو نالییەی
هەرچەند دەڕوات ناگاتەوە
شارەزوور و حەبیبەکەی

١٩٩٨



## بیرەوەییەکانی ڕۆژژمێرێکی شەکەت

هەنگاو بنێ بەرەو شارێ
عیشق پەی بەرێگای نەبات
ئێوارەیەک زەمەن پیاسەی دەکرد
ڕازی نهێنی دڵی شەوگاری
بۆ شەقامە... مەعشووقەکان
دەوتەوە
چەن لە چرپەی پێی هەنگاوەکان بێزارم
بەبێ پەروا بەدووم دێن و
نهێنی یاخیبوونم لە گەردوون
بۆ ئەو دەریا تووڕانە دەگێڕنەوە
شێتانە سەری شەپۆڵەکان
بە(ئەلحەد)ی تاوێرەکاندا
دەکێشێ...
سپێدەکی دی
ز
ە
م
ە
ن



خەونی گوڵ و
تەرزی لاولاوەکانی لێک ئاڵاند...
باڵندەیەک لە خەویدا
باخچە سەری گوڵی دەبڕی
(با) یاری بە سووتە مەڕۆی
نازنازە بێنازەکان دەکرد...
ئای لەم سەرە جەنجاڵەی من چەند شێتانە
بیرەوەرییەکانی خۆی... لە گۆڕەپانی کاری
کۆترە ماندووەکانی ئەویندا
گڕ تێ بەردا...!!
من ئەوەندە
پۆلووی ئاگردانە ساردەکانم
گەرم کردەوە
پەنجەکانم سوور هەڵگەڕان
هێندە عاشقە مانگ بووم
ئەستێران بەدوومدا دەڕژان
من
م



## نزایەک لە داوێنی هەورە ڕەشەکاندا



گوناهەکان
بەسەر یاسای چەوتی زەمەندا
گەشتیان دەکرد
گومڕاتر لەو سازەی نەرمە ئاوازی
نامۆ بوونی ڕۆح و
سەمای درەختە پایزییەکان
د
ە
ژ
ە
ن
ێ
ت
و
لە ژێر سێبەری برژانی خۆرەتاودا
ئاوێنەی پیرۆزە دەبوون و
پرچی نیگرۆی خەونەکانیان
دەهۆنییەوە...
سەرم شارە مێروولەیە

جەستەم دەواریی شڕی نامۆیی
باڕیزە تیایدا دادەکات
لە نێو کاسەی بادەی تەمەن
دوا پێکی تاڵی هەڵدەدەن
بەر لە نامۆ بوونی ڕۆحە نەزیهەکان
نەوڕەسی هەڵوەدای نزا
بەداوێنی هەورە ڕەشەکانەوە
لە دار
درا...
زەردەپەڕان
بەر لە ژوانی ئەستێران
پەنجەرەی ژوورەکەم واڵا دەکەم
ڕۆحی ئەو پەپوولانە دەبینم
تا سووتان عەشقی هەتاو بوون
ئەمێستاکەش یاری بەپرچی
با
دەکەن...

١٩٩٨



## گەڕانەوە

پێشکەشە بە باوکم

لە سووچی کام پەنجەرەوە
گەڕایتەوە کۆشی وجود
لەو گۆڕستانە چڕەدا
بەم شەوە ئەنگوستەچاوە
چۆن خەمانمت بیر کەوتەوە
ئا ئەوە تۆی
لە ئامێزما بەتاسەوە ماچت دەکەم
پاش سەفەری ناوادە
تۆوی حەز لە کێڵگەی دڵمدا دەچێنی و
نیشتمانە خاپوورەکەی جەستەم بنیاد دەکەیتەوە
ئەی پار ساڵ بۆ؟
باکەی خۆت و خەونە وەنەوشەییەکانی منت پێچایەوە
ڕۆشتی... منیش... تەنیاو تەنیا
ڕاستە ئێستا هاتوویتەوە
ئەمشەو خەونێکی نارنجیت
جیا لە خەونەکانی دیم
ڕێگات پێ نادەم دەرباز بیت
تا چیدی ڕانابمەوە با لە دنیای خەونا بژیم
گشت ساتەکان دەکەم بە شەو
هەرگیز لە دڵما دەرناچی
لەزەتی خەو...



# سووتان

شەوەو لەناو ژوورەکەمدا خەم چرایە
ئارامیم باڵندەیەکی
وێڵ و بێ لانە و شەیدایە
دەسا گیانە...
لەم شەوەدا وەرە و ببە
بە هەوێنی شیعری تازەم
مودەتێکە سۆز و شیعرم
رێبواری نامۆو تەنهایە
من تەنها یەک خەمم نییە
بەڵکو خەمی من چیایە
نیشتیمانم
بارانی وەرزی بەهاری
بەسەر کێڵگەی دڵی مندا دادەبارێت...
من رێبوارێکی ماندووم،
دڵی پەستم لە رێگای عەشقی تۆدا
چرایەکی هەڵکردووە
هەتا ئەبەد
دەسووتێ و
ناکوژێتەوە...





# گیتارێک لە ژەنینی ئاوازەکانی وەڕەس دەبێت

جێی پێیەک رێگا نەماوە
ئەسپی خەونە سەرەڕۆکانی ئەمەلی تیا غار بدەین
دەوارێکی شڕ شک نابەین
نامۆیی رۆحمان داپۆشێ و
بەسەر جەستەی شەکەت و نغرۆ بووماندا هەڵیدەین...
چیتر
لە مۆزەخانە دێرینەکانی مێژوو
بەدوی سەری بێ جەستەو دەستی لە قامکدا براو...و
مرواری گەشی بینایی لێڵمان دەگەڕێن
کە بەدوورگەی چاوە بێ سۆماکاندا تێ دەپەڕێت
سەر هەڵمەبڕە
نزای باڵندە باڵ خوێناوییەکان
پەلکێشی دوا وێستگەی دەیجوورت دەکەن
بەشوێن هەنگاویان مەکەوە...
زنەیەکی لیخن
درەختە رووتەڵەکانی دارستانە سووتاوەکەمان ئاو نادات
شنەبایەک باوەشێنی روخساری ماندوومان ناکا و
ئاوێنە تەڵخەکانیش پشت لە داهاتوومان دەکەن
سیمای حەسرەت بارمان دەشێوێنن و

رابردوومان بەئەفسانە دەگێڕنەوە
بەدوای تریفەدا دەڕۆین
سێبەری ڕۆژ ون دەکەین...و
ئەلبومی یادەوەرییەکانی منداڵیمان (با ) دەیبات
دووی تارمایی خەونە بێ داڵدەکانمان دەکەوین
لەو دیو سنوورەکاندا... لە هێلێکدا
لەتەک شەستە بارانی قەدەردا
بەیەک دەگەین
تەرمی ڕووناکی دەسپێرم بە ناخی دوورگە نووتەکەکانی بوون
ئەویش دەست لە دەستی پەڵە هەورێک دەنێت و
بیابانە چڕەکانی غوبار جێ دەهێڵێت
وەک ئەو گیتارەی وەرەسە لە ژەنینی ئاوازی خۆی...!
فریشتەکان بەرگی سپییان داماڵی
وتیان ئیتر
نابینە گەردانەی مانگ و وەک ئەستێران
خۆمان لە بەرۆکی ئاسمانە پرچ خۆڵە مێشییەکان نادەین
و
سێبەری درەختە شۆخەکان
ناکەینەوە بەدوا ژووانی بێداری
من لە ڕازی دڵی ژانە جوانەکان بێ ئاگام
بەبێ چرپە بەشوێن هەنگاوەکاندا
مل دەنێین و
تۆوی وەنەوشە دەچێنن
وەلێ ڕێگاکان هەر دڕکەزین
نهێنی ژاکانی



خونچەی لێوی گوڵەکانم
لەو دڕکانە پرسیار دەکرد
بێ شەرمانە بەلێوی شەقار بردوویان
گوڵاوەکانیان هەڵدەمژین
ئەو گوڵانەی
خەونەکانیان تراویلکەو
هەڵوەرین دوا وێستگەی تەمەنیانە
مەرگیش
مەنفای عەشقی ئەو کچە مەئیوسانە بوو
لە باخچەکانی ئێوارەاندا
لە کۆشی خەیاڵێکی قووڵدا
ڕۆحیان نەرمە سەمای دەکرد
لە خۆڕا ئاوازەکانیان کپ کراو و
بەخۆزگەکانیان وت
ئ
ە
س
ە
ف
.
.

ئایاری - ١٩٩٩

## ژمارەکانی بێ ئۆقرەیی

لە خەراباتی وەرزێکدا
ڕۆژێک ڕۆحم هەڕاج کرا
لەو ڕۆژەوە دڵ ساباتی حەسانەوەی زامی قووڵە
ڕەنگە نزای پاسارییەکان بگاتە ئاسمان
وەلێ خوایەک لێی ناپرسێت...
لە سێبەرێکی نوستوودا ڕێی گەشتەکەمم گرتە بەر
نیگاکانم لە کۆڵانەکانی بێدەنگیدا هەڵدەکورمان
نهێنییەکان لە پرچی لوولی ڕەشەبا ئاڵۆزترن...
فرمێسکەکان لە چاوانمدا پیر بوون و
لە ئینجانەکانی تەمەندا ڕژان
پرسیارەکانیش
قووڵتر لە وەڵامە سادەکانی ڕۆژگار خۆ دەنوێنن...
ساناتر لە بەفری پاش بارانی یەئس
دەتوێنەوە
نیگام قەیرەیەکی تەڕپۆشە و
لەبەردەم دەروازە کلۆمدراوەکانی قەدەردا
بەماتی هاتوچۆ دەکات
ژمارەکانی بێ ئۆقرەیی دەژمێرێ و
شادی لە فەرهەنگیدا هیچە



دەکرا وەرزێکی گوڵاوی
بێ لە وەرزەکانی ئێستا
دەستەملانی خەونەکانی دایکم بێت و
پێڵووی چاوە لێڵەکانی سورمە ڕێژ کات
ئەو دەمێک بوو
پشکۆی نوستووی ژێر ژیلەمۆ ساردەکانی دەپشکنی
بەدووی سۆراغی پەیڤێکدا
زەمەن جەسارەتی نەکرد
وەڵامێکی بداتەوە...و
شنەبایەک بە شانەی حەز
کەزیی بەهاری تەمەنی دانەهێنا...
لە تەمتوماندا ون دەبم
دەبمە تنۆکە ئاو... و
دەتکێمە سەر ئەو کێڵگانەی
لە تێنوواندا لێوەکانیان شەق دەبەن
دەڕژێمە تاریکی شەوێکی شەکەت
کتێبە تۆمار نەکراوەکانی جەنگ دەنووسمەوە
وەکو فاڵچی بەنێو دێڕەکاندا دەگەڕێم
بەتەنێ مانایەک
بۆ وەرینی گوڵەکان و کودەتای وەرزە ئاڵەکان
نادۆزمەوە...
وەک کوکوختی سەر دوا چڵی بێدەنگی
وانەکانی نەفڕین ئەزبەر دەکەم

نەخشەی سێبەرێکی خەواڵوو
لە چاوە بزێوەکانی خۆردا دەکێشم...
ئێمە زەمەنێکی ونین
لە مێژووی نادیاری شتەکان دەگەڕێین
لە دەواری پێچراوەی ڕۆژ
لە چاوە ئەبڵەقەکانی شەو
لە پەنجە ئەفسووناوییەکانی(با)
لەو پرسیارانەی لە فەرهەنگی ژمارەکاندا
دەرەنجامێکیان نەداینێ
تا بورجی لەدایکبوونمانی پێ بەیان کەین

نەورۆزی/ ١٩٩٩



## سەفەری باخچەو خەونی نائومێدی گوڵەکان

گشت وێستگەی نیشتمانە غوبارستانەکەم پشکنی
ڕوانیم
هەر سەفەرە شاری عشقی دڵە نامۆکان خاپوور دەکا
ڕەوە باڵندەی کۆچەرە
ئاسمانەکان بەجێ دێڵن و
هەگبەی خەونێکی سپییان لە کۆڵدایە
درەخت ئاسا
سەمای کۆچ و مەرگ دەکەن
دوا وەسیەتیان
بەختێکی سپی لە پەڕەگرافێکی ڕەشدا
بە ئەمانەت دەسپێرنە شەپۆلی دەریا و
لە پریاسکەی ناخودا حەرامزادەکاندا
بۆ ماسییەکانی دەنێرن
خەون بیابانێکی بێ کۆتا بوو
سەرابێک بوو نا ئاسا لە ڕەوتی زەمەن
گۆرانییەک بوو لە تەنهاییدا دەبێژرا و
لە جێی ژوانی ڕۆحەکاندا
کپیان دەکرد
منیش
لەدوورگە تەماوییەکانی بێ ئۆقرەییدا

گەشتێک بەناو ڕۆحی شەوی یەڵدا دەکەم
لە نهێنی ساتەکانی بێداری و
تاریکی ورد دەبمەوە
ئەمشەو خەون تراویلکەیە
بێ دەربەست شوێن پێی کەوتووم
دەستم دەگرێ
ڕا دەبمەوە پێنج پەنجەی دەستم قرتاون
بۆ سبەینێ لە درزی
دەرگا کلۆمدراوەکانی تەمەنەوە
دێنە ماڵە تاریکەکانی ڕۆح و ئاوازێکی دی دەژەنێ و
نۆبەرەی وەرزی ئەم عیشقەم بەخەمێ تر ئاوس دەکا
پیرەژنێک
سیمای بەپەیکەرە ڕووخاوەکانی بەر شۆستەی قەدەر
دەچوو
پنجە وەریوەکانی زەمەنی
لە هەگبەیەکدا لە کۆڵ نا...
شیعرێک بۆ پەیڤە ئاڵەکانی دەگریا
لە گێژەلووکەی یەئسدا
پرسی لە (با) و باران دەکرد
تاکو ئەمڕۆش من و نیشتمان غوبارین
بەشەقامە دڕکاوییەکانی گوماندا گوزەر دەکەین
ئاسۆیەکی تەماوی دەکەینە ئاران
پەیکەرسازێک پۆرترێتی ڕووبارێکی کێشا و
پەیکەری کچێکی ڕەشپۆشی دروست کرد لە بەفر
بە ئاهی شەرمنی دڵی خۆرەتاوێکی زستاندا توایەوە
لەم وەرزە بەستەڵەکەدا



زەمەن گەرمەتا دەیگرێ
بەئەشکی چاوی ئاسمانیش... تاوێک فێنک نابێتەوە
چیمان لە باران بەدەست کەوت
دوورگەکانی چاومان وشکەڵاتن
نەگەیشتنە سای درەختی چاوەڕوانی
زەمەن بەکەشتییەکی شکاوەوە
پەنجەکانی کرد بە سەوڵ و
بەندەرەکانی جێهێڵا...
بیابان تینووتر بوو لە تاسەی ئەو قەیرە کچانەی
لە چاوەڕوانی خەونێکدا پیر بوون
(دەشێ تا مردن نەیبینن)...!
دیسان خەون
چاوی کاڵی خەم دەڕێژێ
دەمامکێکی تازەتری لەسەر دەنا و
سەفەر دەکات
سەفەر... سەفەر
هێشووە خەندەیەک لە یەئس
دەست و پێیەک بوو بێ پەنجە
سەفەر حەزێک بوو لە نائومێدی و
هێشووە خەندەیەک لە یەئس
دەست و پێیەک بوو بێ پەنجە
گوڵێک بوو بۆنی هیچی لێ نەدەهات
ئاسمانێ بوو بێ ئەستێرە و
لەتە مانگێکی بەجێماو ئەم سروشتە
بەجووتێ چاوی بێ ڕوئیاوە
لە تارمایی ئەو ڕادەما...

١٢ - ١٩٩٩

## جوانییەکانی داوێنی گوناه

ڕۆژ دەگوزەرێ و
زاکیرەم بۆ ساتێ نانوێ و خەمەکان دەرێسێتەوە
دایکم بەدەستە لەرزۆکەکانی
برینە بەسوێکانی قەدەر باوەشێن دەکات
شەوان باوکم
گۆڕستان بەجێ دەهێڵێ و
دێنە میوانداری تەرزە مێوە
زەردەکانی حەوشەکەمان
بەنهێنی ئاویان دەدات
ئەو
کووچەیەک
شارێک
کیشوەرێک نەما
فرسەخ
فرسەخ
بە سەعادەتا نەگەڕێ
نەیدۆزییەوە...
ئەوین مرد و
نەردوانەکانی موحیبەت داڕووخان





ژیان بەشەرمەوە سەری بڵند کرد
بەرستێ پەیڤی پساوەوە
ئاخافاتن
ج
ە
خ
ا
ر...
لە تێکئالآنی وەرزەکان و
لە باڕێزەی تەمەنێکدا
سەرێکم هەبوو...و
سەدان خەون
پێکەنینێک و هەگبەیەکی لێوا و لێو لە گریان...
ئەستەمە
گەیشتن بەو ئەستێرانەی
لە ئاسمانی ئەو بەرمانەوە هەڵدێن و
میوانداری
شاری چاوە بێ سۆماکان ناکەن...
مەلە کردن لە دەریاکانی وەهمدا
بەرەو دوڕگەیەکی دوورتر لە سەرنج
سەراسیمەم دەکات
بەرەو دوڕگەیەکی دوورتر لە سەرنج
سەراسیمەم دەکات

گەیشتن بە یاقووتەکانی ئاسوودەیی
زەمەنێکی دووری دەوێ
دوورتر
لە گەیشتن بە شاری موحیبەت
دوورتر
لە گەیشتن بە ئارامی کاتەکان
دوورتر
لە ئاشتبوونەوەی وەرزەکانی چاوەڕوانی
دوورترو دوورترو دوورتر...
لە سەوڵدانی کەشتی ڕۆحی ئەم زەمەنە
پەنجەکانم هەڵوەرین و
نەمتوانی
ناخی دەریا و
شەپۆلەکان بخوێنمەوە
نیگام لێڵ بوو
هێندە شەوەزەنگم دواند
بەرسڤێکی نەدامەوە
گوناە دەستی درێژ کردو
ئێمەش شوێن هەنگاوی کەوتین
قەدەر پێمان پێدەکەنی و
چلوورەی گوێسەوانەکان
لە حەسرەتا توانەوە
ئێمەش نەفامانە هەر دەڕۆیشتین
بەیادی کلاسیکەوە:



## دووری

دووریت شەوەو
ئاسمانی چاوم دەتەنێ
بەتەم و تاریکی و تووشی
زریانێکە...!
پەنجەی دەستە نامۆکانم
دەتەزێنێ
دووریت خەزانێکی سەختە
بە شانەی خەم
کەزیی بەهاری تەمەنم دادەهێنێ...!
بێ پشوودان
تاڵ...تاڵ... هەڵیدەوەرێنێ...!



## بەشێک لە قەسیدەیەکی تەواو نەبوو

لەگەڵ ڕۆژگارە تەماوییەکاندا
پایتەختە کریستاڵییەکانمان دەپشکنی
لە سۆراخی گوڵێکی سووردا...
بۆ دزینی چراکانی خۆشبەختی
بۆ ڕفاندنی تریفە لە مانگ
بۆ پیتەکانی لای لایە
تا خەونەکانمان نەزڕێن...
بۆ ڕیتمێ لەم بالیا بێ نەشئەیەدا
مەستمان بکات
لەوەتەی ژان
سووری بەر خۆزگەکانمانە
من و کات و بێ ئۆقرەیی
نووتەکە شەو دەلاوێنین...
کە جەستەی سڕی خەونێکم
بەگۆڕستانی بێ ئاکامی دەسپێرن
لە خۆراوایەکی ساردا
زەمەنی خۆزگەکانم
ژێی کەمانەکەی دەپێست و
پەنجەکانی هەڵدەوەرێن



ئاوازە خەمینەکانیش
لەتەک هاژەی شەپۆلێکی سەرەڕۆدا
بۆ ئۆقیانووسە تووڕەکان
سەر هەڵدەگرن
ئاوڕێ لە مەنگی دەریا نادەنەوە...
هیواکانم
لە سپێدەی سپێدەیەک
سپی تر بوون
خەونی زڕاوی تەمەنێک بوون
بەر لەوەی خۆر هەڵبێت
لە شەوگارێکی نووتەکدا
چاویان لێک نا...

١٩٩٩/١٢/٢٤

## گۆرانییەکانی مەعشووقێکی ئەفسانەیی

ئێوارەیەک لە بێدەنگیدا خۆی دەخواتەوە و
شەویش زمانی لاڵ دەبێت
بەئاوابوونم لێڵ مەبە و
بەمەحزوونیم ئاگر لەناخت بەر نەبێت
خۆریش دەمێ
چەتری هەوری بەسەردا دەن ئاوا دەبێ و
سینگی هەورێکی ڕەش بۆ خۆی شەقار دەکاو
لەوێ دەنوێ...
تاکو تۆ لەم خەوە ئەزەلییە ڕادەکەمەوە
هەزاران جار وەنەوز پێڵووەکانم دەبا و
خورپەی ناخی سپیدە وەئاگام دێنێ
وەئاگام دێنێ و لەبێداریم مارە دەکات
ئیدی دەبمە دەزگیرانی ئەو و
لە زەمەن گومڕاتر دەڕوانمە ڕووی ساتەکان
لە باڵندەیەکی هەڵەتە نامۆتر
بەنێو قەفەسی شینی ئاسماندا گەشت دەکەم و
ئامێزی مەعشووقە خەمبارەکانم
بەبێدەنگی و نیگەرانی ساتەکان دەسپێرم
لە مەملەکەتێکەوە هاتووین



بێ ناونیشان لەجوگرافیای بووندا
تۆشەبەرەی خەونەکانمان
پڕ لەسێوی ڕەنگاو ڕەنگە
کەچی ئەسپی هیواکانمان
بەدوی لەتە سێوێکی گەنیودا غاردەدەن و
نیگاریشمان ئارەقەی نیگەرانی لێ دەبارێت!!
بادەکان لە فوارەی خوێنم گەرمتر هەڵدەچن
شووشەکان هێدی تر لە خەیاڵم
دەشکێن و دەزرنگێنەوە
ڕۆحم لە شەوگار وەڕەستر
لەگەڵ زاکیرەمدا دەدوێ
لە ململانێی بووندا شەکەتی لێ دەڕژێ
تۆ ئەی ئەوەی
هەموو ترووسکە ڕووناکییەکانی ئاسمان دەچنیتەوە
تاوانی نابیناییم مەخە ئەستۆی ئەو گوڵانەی
ئاوێتە بە ڕوانینم بوون...!
ئەو دەمانەی نازنازەکان بەشەرمەوە
نازیان بەسەر من و گوڵەکانی باخچەکەمدا
دەکرد
خۆشەویستیم وەکو هەنگ بوو
کە ژەهرە هەنگوینی ماچێکم
بەسەر لێوی ئاڵی
مەعشووقێکی ئەفسانەییمدا دەڕژا

دواچرکەکانی تەمەنم لە حەسرەتا ڕادەوەستا و
مەرگ لە ئامێزی دەگرتن
ئیدی ڕۆحم لە جەستەم و
گلێنەکانم لە چاوم وەڕەس دەبوو.
وەرزێک زەمەن چوون ڕوخسارم پەمەیی بوو
ڕۆژ وەک جەستەی گەرما بردووم
شەونمی خەمی لێ دەتکا
ساتیش وەکو ناخم دوا ئاهی هەڵکێشا
لەگەڵ کاتژمێرێکی نیوە نووستودا دەدوا
زەمەن چی گەڕیدەیەکی شارەزا بوویت
پیاسەی گشت کۆڵانەکانی
بەختەوەریت پێ کردین و
لێ نەگەڕایت
لە کوچەیەکدا نووچێ بدەین و خەندەیەک
لە نێو درزی لێوە قڵێش بردووەکانماندا ڕابکشێت
تۆی دەریاوانی زیرەک و ئێمەی مەلەوانی نەفام
زیخەڵانی سنگی هەموو دەریاکانت پێ پشکنین و
دەنکە یاقووتێکی ئاسوودەییمان پێ نەبرا
بیدەین لە بەرۆکی ساتە بێ ئۆقرەکانی تەمەن
سینگی گشت قەلە ڕەشەکانمان شەقار کرد
خۆرەتاوێک کوانوی دڵی گەرمی
بەرووی کێڵگە ڕچیوەکانماندا دانەگیرساند و
پێت وتین:



لەم ماراسۆنی ژینەدا
هەنسک بۆ کۆترە پووکاوەکانی
سەر گوێسەبانەکان هەڵمەدە
ئەو دەمەی مانگ
ماچی ڕوومەتی شەوی کرد
ڕەژووی ڕۆحم بۆخۆم و ئەو هاوڕێیانەم،
کە ماچمان لەبیر چووبووەوە
دەبووە پشکۆیەکی گەش!
پشکۆیەک بەنەرمە فووی با
دەبووە گڕو دەکەوتە سەما...
تۆ قەتماغەی برینە بەسوێکانم وێنە دەکێشی و
مەلەی گشت ئۆقیانووسە
وشکەڵاتووەکان
بەماسییە شەکەتەکانی نێو جەستەم دەکەیت و
پاشان دەپرسیت
بۆ مردن؟؟

## لیمۆ بەهارییەکانی تەمەن

سپێدەیەک لە جریوەی ئەو چۆلەکانە وەخەبەر هات
فڕینیان لەبیر کردبوو
نیوە شەوێک
ملوانکەکانی خەیاڵم لێک دەئالاَن
دەپسان و گرێ کوێرەم دەدانەوە
تنۆک تنۆک
گوڵەژانم دەخستە دەروونی دەریایەکی
بێ ئۆقرەتر لە بینایی گوڵێکی سووری بەر هەتاو...
زەمەن بەهەشتەکانی تۆ
دۆزەخی دەروونمن
گەمەکانی خۆت و خەندەکانی من هاوتەریب مەکە!
شەویک چاوم لەکن یاساوڵەکانی قەدەر بارمتە کرد
ئیدی نە لە باخچەکانی بەهاردا نووچێ دەدەم
نە لە زەماوەندی گوڵەکاندا سەرچۆپی دەگرم
نە بەرێکەوت نیگایەکم
دەڕوانێتە چاوی مەستی ئێوارەیەک
لە باڵکۆنەکانی سەفاوە
بەچارەنووسی مردووەکان پێمەکەنە
ئەو مردووانەی



بەشەقامەکانی بەر ماڵتاندا دەگوزەرن و
لە میوەی باخچەکەتان ورد دەبنەوەو
پێت یاساغە چلێ ئومێدیان تێگریت...
تۆ لەکوێرە ڕێیەکەوە
دڵنەوایی بەیانییەک دەکەیت
کاس بووە لە باسی هەقیقەت
نزای ڕۆژەکان بەترس ناو دەبەیت و
نوێژەکانیان بەتاڵ دەکەیتەوە
ژەنیارێک فووی کردە گەرووی نەی
خوری پەرچەمی بە با کرد
زەمەن
شوێن پێی کاتژمێرە بێ چرکەکانی تۆ کەوتم
ڕۆژ بە مانگ تێدەپەڕی
مانگ بە ساڵ و ساڵ بە سەدە
سەدەکانیش هەزارەیەکیان دەخایاند
عیشق لە سێبەرێک نوست و
ئێمەش لە زەمهەریری بیابانەکاندا.،
نینۆکەکانمان هەڵوەرین.
چ داستانێکت بۆ بگێڕمەوە؟
بیرەوەرییەکی شەرمن
بەتەم ڕووی خۆی دادەپۆشی
شەوگار لە بێدەنگیدا ئاوس دەبوو
ژانی بەسپێدەوە دەگرت

گەنجێکی خەرەفاو
لە پەسا شەرابی ئەوینی دەڕشت و
شووشەکانی تووڕ هەڵدەدا
مردن لە سای درەختێکی ئارامدا
زەماوەندی دەوێ...
دوێنێ زەردەواڵەیەکی گۆشتن
ماچی لێوی یەک بەیەکی
گۆڵی باخچەکەمانی کرد
من و هەنگ و پەپوولە پاسەوان بووین!
چەند ئەستەمە
شەرابی ئەم پێکەنینەش لە لێوەکانمان داچۆڕاو
پێڕا نەگەشتین چۆڕێکی بخۆینەوە
ئەم تەمەنەشم لەبارچوو
دڵۆپێک خوێن لە جەستەی بیمارم نەڕژا
خەونەکەم بەتاڵ کاتەوە...
لای ئەو دەریا مانگرتووەوە تێپەڕ بووم
ماسییەکان ئاویلکەیان بوو
بڕیار بوو بەئەشکی هەور
خۆیان بشۆن
ئێراهیەکی درەنگ وەخت ئەستێرەکان
عەبا ڕەشەکەی دایکمیان بەسەردادا
مانگیش بەفۆتە سپییەکەی
سەری خۆی داپۆشی



سیمای ئاسمان تادەهات ڕەش دادەگەڕا
تەنها سیمای هاورێکانم
گشت (بێ) ڕەنگ بوون
چوون زەعفەران
تاڵ چوون بیرەوەری ڕۆژێکی شلەژاو
عەیامێ دەپەنجەم درەختی زراف و
میوە ڕەنگاڵەی گرتبوو
ڕۆژانە باخەوانێکی کووڕ
بەکامەی گۆچانەکەی میوەکانی دەڕنی
ڕەشەبایەک
بەهێمنی تەرزەکانی نەوی دەکرد
زستان کە سەرمای دەبوو
بۆ کوانوە ساردەکەی شالقێکی دەبڕی
ئێ ئیدی چ تۆوێ
بڕژێنم بەسنگی کێڵگەوە
تا لیمۆی ڕوخسارم هەمیشە بەهاربێت

## سێبەرەکەم بەخۆم دەچێت

ساتەکان ئەودیوی مەنگیم دەشلەقێنن
یۆتۆپیاکانی زەمەنیش
گەمە بەچارەنووسی بتە زیندووەکانی
نێو پەرستگای ئەوینم دەکەن
زەمەنێک تەڕی ڕوخسارم ڕادەمووسێت
خەندەیەک لێوم دەکرۆژێ و
من بەرامبەر چاوەڕوانی ئێستێک دەکەم
بزەیەک بەئەشک
گەردوای سیمام دەشواتەوە
گەرووی کاتژمێرەکەشم گشت چرکەیەک
هەنسکێکی قوڵ هەڵدەداو
ئەندێشەیەک دەیباتەوە و
پۆزش بۆ حەسرەتباری ڕوخساری ڕۆژ دێنێتەوە
بەسپێدەیەکی ڕەش داگەڕاو دەڵێم:
ئەو کۆترە ماتانە مەکوژە
کە پەنجەرەکانی ڕۆحیان کردووم بەگوێسەبانە و
بەسەر دیوارەکانی ناخمەوە هەڵنیشتوون و
چاوەڕوانن کات ئاوا بێت!
سێبەریشم بەخۆم دەچێت



لە ڕۆشناییدا ون دەبێ و
تاریک دادێ پیاسە دەکات
ئەندێشەم دەمێ هەڵدەفڕێت
لەسەر دواچلێ ئەستێرەیەک
باڵەکانی هەڵدەوەرێ
ئیدی جەستەی لە جەستەم جوێ دەبێتەوە...!
کە سروەی شەماڵی نیگات
بەبیابانی هزرمدا دەگوزەرێت
دڵۆپێک لەخوێنی هەنار
دەرژێتە سەر لێوەکانم و
بەرگی درەختێکی تەڕ پۆش دەپۆشم و
ڕەنگی گوڵێکی هەمیشە بەهارم لێ دەنیشێت
نیگایەکی پەرت بوو
پێناسەی دابڕانی بۆ لەتەکانی خۆی دەنووسی!!!
من و مانگ و سێبەرەکەم
هەر لەبانگی شێوانەوە نوێژی جوانیمان دادەبەست
وەلێ دەمێ سێبەری ڕۆژ
بەسەر دڵی خاکدا دەرژا نیگاکانمان پەرت
دەبوون و،
ڕازەکانمان دەئالۆسکان
کە سات دەنوێ و تۆ چاوەکانت لێک دەنێیت
شەو لە غوربەتی خۆی تێناگا
چاوەکانم بەدوورگەکاندا دەڕوانن

ئاسۆی ڕوانینیان ون دەبێ
ئاسمان و خاک دەس لە گەردنی یەک دەنێن
منیش نازانم چ باسە...!!
لە ڕەوتیشدا بە با ناچم
ئەو کەمێک لەمن خێراتر شەقاوەکانی دەهاوێ
دەڕواو ئاوڕێک لە نیگەرانی دڵی من و
چاوی سات و
بێ ئۆقرەیی سەمای تەرزی
لاولاوەکان ناداتەوە.



## ڕۆمانسییەتی من و ئاگر

دەمێ سەدای پێکەنینت
ئاسمانیش سەرقاڵ دەکات
پێت وانەبێ
چۆک بەگومڕاییم دادەدەیت
لەدوو چاوی کۆترێکی نابیناوە دەڕوانمە،
گوێسەبانە تاریکەکانی ڕۆژگار و
لەو دیویە بەنهێنی تێڕوانینی
بێچووەکانی تۆمار دەکەم
متمانەم بەقەدەر نەکرد
ئەو دەمانەی
ڕووی تەڵخی ئاوێنەکانی
بۆ پەیکەری سەرابییم پاکژ کردەوە
بەدەسرێکی وەنەوشەیی
شەونمی سەر ڕوخساری
گوڵێکی شەکەتی دەسڕی
شەو بەبۆنی ئەو گوڵانە
مەست نەدەبوو
کە هەناسەت دەیژاکاندن و
هەنگاوت بەسەردا دەنان
قەڵەمی دەستی (با)ی فڕاند



نهێنی دڵی دوێنێکە
بۆسبەینێ بگێڕێتەوە
کە چرپەی هەناسەی (با) دێت
نیگام چاوی بۆ دەگێڕێ... و
ئەندێشەم گوێی بۆ هەڵدەخات
پەنجەکانم دەستی دەگرێت
نە با وەک من نامۆ بێت و
لەم تەمەدا ڕێ هەڵەکات
نە ڕۆژ دەس لە خۆر هەڵدەگرێ
نە تاریکی دەس لە ئەستێرە بەر دەدات
کە زاکیرەم بەبیرەوەری منداڵی
کاسە سەرم پڕدەکات
ڕادەمێنم
لەو هەنگەی گوڵێک ماچ دەکاو
هەنگوین لە لێوی دەچۆڕێ...
زەمەنێک
سۆری دڵی نەرمی بەردێک
دایدەپۆشیم و
زەمەنێکی دی...
خۆزگەکانم دەکردە چەپکێ وەنەوشە
بەدیاری دەمدان بەمردن
لە ئامێزیان سۆماکانم تاوێک بەهێمنی بنوێ
گشت دەروازەکانی بەهەشت
بۆ تێڕوانینم واڵا بوون



تێم نەڕوانین. ،
ئەستەم نەبوو
خۆ دەکرا لە دۆزەخیشدا
پەرییەک دەستەکانم بگرێت.!!
ئای لە ڕۆمانسییەتی من و ئاگر
ئەو دەمانەی
شین بۆ مردنی پەلکە گیایەک دەگێڕین
سانایانە
بەخۆڵەمێش بوونی جەستەی خۆمان
بیر دەچێتەوە...
ئەو پێشکانەی خۆشیان دەوێم
شەوان ماچ لە لێوم دەدزن
بەزامەکانی سەرگۆنام پێدەکەنن و
دەڵێن وەڕەسیت لێ نایەت...
تۆ دەرگا داخراوەکانی بوونت واز کرد... و
وەلێ خۆشت بوویت بە تەم و
ڕووت کردە ماڵی تاریکی
هەنگاوێک پەی بەڕێگات نابات
لە نهێنی بوون تێناگەم
ئەگەر ئاسن هەستی نییە
بۆ بەئاگر دەتوێتەوە؟
درەخت ئەگەر عاشق نەبێت
چۆن بەدەم شنەی بایەکەوە
سەما دەکات...!؟

## چەمەرییەکانی پێکەنین

دەمێکە یاسا چەوتەکان
جەستەم دەکەنە پەیکەری دارووخاوم و
لە ئاتەشگای زەمەنێکدا
ڕەژووی ڕۆحم بە(با) دەکەن
چرای چاوی سپێدەکان نوقمی تاریکایی دەکەن.
وەکو ئەشکی هەورێکی ڕەش
بەنێو پردی خەیاڵی پەرتبووماندا ڕۆدەچن
جامەکانی شەو بێدارییان لێ دەڕژا.
منداڵی لە خورافەی پیریدا
سەری کاس کردین.،
گەنجی هێند هەناسەی سەردو دووکەڵی سپی بە با کرد،
لە شەقامەکانی غوربەتدا شەکەت بوو
بەپێی چەپی خۆی کرد بەماڵی یەئسەوە!
دوا سرتەکانی تەمەن هۆشیان بەخشین بە گومان
لەوێدا لە خۆمان ون بووین...
تۆ دەنکە هەناری بیرەوەرییەکانت
بەسەر سینییەکی قوپاودا ئەوڵی
دارتووە وشکەکانی بەختەوەریت ڕادەوەشاند
تۆوی ڕەیحانە ڕەشەت لە بیابانە بەژەکاندا دەچاندو
لەوێرا چاوەڕوانی شکۆفەی نێرگزت دەکرد



بەکسپەی هەناسەیەکی پەنگ خواردووی ساردتر لە زریان
ڕاهیبەکانت لە پردی سیراتەوە گل کردە خوار،
مەعبەدەکانی ئەوینی ساڵەهایانت داڕماند،
پەنجەکانت لە کوشتنی بتێک بەرپرسیار نەبوو...
عەیامێ بوو
سەبەتەیەکی دڕاوت بەدەستەوە گرتبوو
بەدەم ڕێگاوە
هەڵووژەی نەگەییو و نارنجی کەسکت لێ دەڕژا
سۆفییانە لە خەڵوەتی ئەوینێکدا
بەزیکری دەروێشانەوە
لە دابەشکردنی نائاسای ئەم بوونە ڕادەمایت
بۆ ئاسمان شەو پرچی ڕەشە و
بەرۆژ سپی دەکاتەوە...؟
خەم کە دەگری بۆ چاوی سوور دەبێتەوە...؟
شادی بە چی پێدەکەنێ؟
ئەگەر لە شەرمی خۆر نەبێت
گوڵە نێرگز بۆ چاوەکانی دادەخات...؟
کاتێ لاشەی پێکەنین سارد دەبێتەوە
کێ چەمەری بۆ دەگێڕێ...؟
دەمێ هەتاو بوو بەکاروانچی سپێدە
نەوازشی بەسەر ڕۆژگاردا دەکرد
بەفر ئاسا
لەبەر تیشکی زیوینیدا توایەوە

چون پۆرتریّتی لاشەیەکی سەرمابردوو
لە مانگی چاوەکانماندا... تیّراماں... و
لە ناخماندا... بیّ ئۆقرەیی... و
لە جەستەماندا... شەکەت بوون
لە هەناوماندا... وەرەسی خۆیی چیّ ئەکرد...!
زمان پەیڤینی بیرچووەوە
لیّوانمان حونجەی پیتەکان
دۆسیەی نزای ئەو باڵندانەم خوێندەوە
بوون بە قەقنەس
نەمدەزانی بیّدادییان
بەدادگای داخراوی کام خوا بسپیّرم
نەبا بە تۆمەتی جوانی مەحکومیان کات...
لە پەنجەرەی ئەو هەورە سپییانەوە دیّمەوە
نەورەسەکان دەرۆزەی بارانیان لیّ دەکرد
لە تەدارەکی ئەو میّرگە وەنەوشانەوە دیّمەوە
تۆوی غرووریّکی ئەبەدییان
لە کیّلگەی خەیاڵمدا چاند
ساتیّک پیّش هەرەسی ئەمەل
چاوەڕوان بووین
یاسەمەنەکانی خۆشبەختی چرۆ بکەن
گوڵی سووری ڕووی ئیّوارەکان نەژاکیّ
(با) ڕوخساری لیّ وەرگیّڕاین!!!
بەرسیلەیەک خەونە میّوژیەکانی شەویّکی



بۆ خۆی دەگیّڕایەوە
تەرزی لاولاوەکان چون پشتی مەولەوی چەمانەوە
دەمیّ بەدیوارە وەهمییەکانی خەیاڵدا...
هەڵدەزنان...و
لە نهیّنی ئەفسوونەکان نەدەگەشتن...
برژانگەکانی حەبیبە،
چون ژیّی گیتارە شکاوەکەی دەستی زەمەن
لە چاوەڕوانی نالیدا پسان...
لە داو تخوبەکانی خەونی ئەو ئیمبراتۆرە دیّمەوە
نیشتمان جگەرەی نیّو پەنجەکانی بوو
لە گەرمەسیّری تەمەنیا
گشت بەفرەکان توانەوە
کلۆ بەفری بیرمان نەبیّت
گشت شتەکان لەبەریانا سوجدەیان برد
چاومان نەبیّت
پرچەکانمان بەڕەوتی (با)
لە پایتەختە شووشەییەکانی فەنابووندا
لەنجەی دەکرد... وەلیّ
ئەستەم بوو تالّیّکی دەسکەنە کەن
ڕیّکەوت دەمانباتەوە سەر ئەو شۆستانەی
چاوی زەمەنی خۆزگەکانیان کویّر کردین
لە سەمای ئەو درەختە پیرانەوە
فیّری تازەترین بالیا دەبم

وەلێ ئێمەو ئەو وەرزانەی
جیا لە ئاشنایەتی ڕۆژگار دەگوزەرێین
گۆرانییەکانمان تێکەڵ بوون
بەنەغمەی ئەو کەنارییانەی لە کەرنەڤاڵی
مەرگیاندا
قەشەنگترین سەما سازدەکەن...
سۆمای چاوە بێدارەکانمان
بەو هێشووە فرمێسکەوە جوان بوو
لەچاوی مەنگی شەوێکی هەڵکورماوی
بەر شەستە بارانی قەدەر
دەرژایە ناخی شەوێکی نووتەکتر لە بوون و
سپێدە وەدەر نەدەکەوت
جیهانێکی نامۆتری لە غوربەتدا کرد بە مەئوا
هاوەڵی ئەو خەمانە بووین
ئارامییان نەدەناسی و بەدەم عیشقی بارانەوە
کۆتری سپی ئەوینیان لە ئامێز دەگرت
بێ ئاگا لە ژانی ڕوحی ئەو ساوایەی
شەوان بەدەم هەنسکەوە
لانکەکەی خۆی ڕادەژەنی
ڕۆژگار سەرابی گەشتێکی بێکۆتایی
دێنێتە سەر ڕێگامان و
تاڵی سپی پرچی زەمەنێکی تووڕە
لە قامەتی پەنجەکانمان دەئاڵێنێ.



کلاوکوڕەیەکی کوژراو
نەفرەتی لەو دێرۆکە کرد
بەخوێن دیوار و شەقام و ساتە جوانەکانی ڕەنگ کرد
هاوڕێکانم تف لە تەرمی خۆیان دەکەن
لە مەڕاسیمی ناشتنی جەستەیاندا
بەمردن پێدەکەنن
پێ بە سێبەری خۆم و ئەو خاکە دەنێم
سبەینێ گیانم دەکاتە مشتێ گڵ و
ڕۆحم بەسەر گۆڕستانەکەدا هەڵدەفڕێت و
جاری زیندوویێتی خۆی دەدا
لە دوندی ئەو یاسایەوە دێمەوە
ژیان شەرابێکە تاڵتر لە پێکەنین
مەحاڵە گەر بینایی‌مان تێی بڕوانێ و
ساتێک هۆشمان ماندوو نەکات
وەلێ ڕۆژانە دەیان جار ناخمان
پێویستی خۆی دەیخواتەوەو
لە تێرامانی ڕۆحماندا شوێن ترپەی پێی
ئەو پەڵە هەورە دەکەوین
تەرزی درەختێکی تازە هەڵچوو... و
کۆمەڵێ گەڵای ژەنگ گرتوو... و
ڕەوە مەلێکی باڵشکاو
بەسەر کێڵگەی
بیابانێکی تینوودا دەبارێنێ

## که مانگ دەنوێت ئەستێرەکان مەکوژێنەوە

بەشەوێکی ڕچیوم وت
گەر پێڵووی مانگ لە ئامێزتا نووچێکی دا
بەپێخەفی تاریکایی دایمەپۆشەو
ئەستێرەکان مەکوژێنەوە
کە ڕۆیشتی بیرەوەرییەکانم جێبێڵە
شەڕی ڕۆژگارم پێ ناکرێت
من و ڕۆژگار هەمیشە ئاشنای یەکین و
لەگەڵ یەکتردا هەڵناکەین
مەمکە ئالآ و لە نیشتمانی دڵتدا هەڵم مەکە
مەحاڵە بێ شنەی (با) بشنێمەوە
کێ لە نهێنی تووڕەیی دڵی ئەم نیوەڕۆیە
تێدەگا...؟
خۆ شەماڵیش ناتوانێ ئاشتی کاتەوە!!
زنەکانی چاوم شەونمیان لێ دەڕژا
کێ دەزانێت بۆچی شەونم
کە دەڕژێتە سەر ڕوخساری
گوڵێکی مەست بەکوڵ دەگری...؟
مەستم مەکە
نەبا مەستی فڕینم بیر بەرێتەوە...



مەمکە ڕەنگ و مەمرێژە سەر ئەو کەڤاڵەی
هەمیشە کەسێک تێیناگات
دووی ئەو ڕەوە مەلەم مەخە
گوێ بۆ سەدای بێچووەکانی خۆیان ناگرن...
مەبە خەم و
شۆێن بێ ئۆقرەییم مەکەوە
ڕۆژمێرێکی دڕاوم
وا سەدەیەک خەریکە دەمنووسێتەوە
کاتژمێرێکی تۆز لێ نیشتووم
هەزارەیەک چرکەیەکم ناجووڵێنێت
مەبە ژان بەشوێن زاکیرەم مەکەوە
زەمەنێکە
ڕێگای ماڵی خۆم و تۆ و ئارامیم ون
کردووە...!
مەبە شەونم و مەڕژێرە سەر ڕوخسارم
ڕووبارێک گەرووی وشکەڵاتووم تەڕ ناکات
ئیدی بەس لێم ورد بەوە
پەرتووکێکی دێرینم و
کێ لەم ڕۆژە مەستەدا دەمخوێنێتەوە...؟
مەبە دەرزی سەر پەنجەکانت لە پێستم مەسووە
با کەللەسەرم شەق نەبێت
نەبا برژێم
کیشوەرێک کۆم نەکاتەوە

مەبە خەو و
پێڵووەکانم قورس مەکە و
مەزێرە ناو چاوەکانم
نەبا گلێنەم بۆ چەند ساتێک کوێر بێت و
ڕەنگێک لە سۆمام ون بکات...
مەبە بە پرد بەسەرتدا تێپەڕ نابم
بەتەرزی درەختە زراڤەکانی وەهمەوە خۆم
هەڵدەواسم
زەمەنێک هەنگاو بەسەر گەردیلەکاندا دەنێم و
لەگەڵ هەورا پیاسە دەکەم.
لە خێڵەکییەتیم مەپرسە
ڕەشماڵێکم ئەستەمە ببم بە وڵات
پێم وتی مەبە پەپوولە... و
بەسەر گوڵی لێوانمەوە مەنیشەوە
نەبا شیلەی ماچەکانم
باڵەکانت بژاکێنن،
فڕینت بیر بەرنەوە!
مەبە هەور وەکو دڵم سپی مەبە
نەبا تۆزی ڕۆژگار بێگەردیت داپۆشێت
ڕووم بەبێگەردی ڕوخسارت هەڵدەخڵەتێ... و
لە وێنای خەونە مەستەکانی بارانەوە وەئاگا دێم
مەبە باران دامەبارە
فرمێسکی چاوی مێژووم بەبیر دێتەوە



کە شارم شەڵاڵی خەم بوو
لە پرسەی مەرگی گوڵەکان!
دیسانەوە دامەبارە
ئەستەمە لەم بیابانەدا چڵە گیایەک شین بێت
لەچاوەکانی ڕۆژگار ڕاماو تر لێم مەڕوانە
شوێن هەنگاوی با مەکەوە
جەستەم لە تاریکی مەسووە
نەبا شەوگار چاوەکانی هەڵبێنێت وەئاگا بێت
گەر ڕەنگیشم لە تاریکیدا ون بێت
هەناسەم دەناسێتەوە
باوەڕ بە ترپەی پێی باران ناکەم
لە وەرزی ئەم ڕچینەدا
لە نهێنی وەرەسی ناخم مەپرسە
ئێ خۆ ناکرێت
وەڵامی گشت پرسیارەکان
لە دڵی من و شەودابێت

## ئێوارەکانی وەڕەسبوون

ئێواران شۆستەکانی ئەم شەقامە
بێ ریتم دەهاتنە سەما
کات بەبۆنی پرچی سنەوبەرەکان
مەست دەبوو
بەپەڕەی گوڵ سیمای ئاواتی ئاڵ دەکرد...
پەنجەکانم تەوقەی پەرچەمی شەوێک بوون
مانگ بەخودکارێکی سوور
چارەنووسی دەنەخشاندن...
تۆ دووی سێبەری هەتاوێک کەوتبووی
ئاوری لێ دەدایتەوە و ناچەوانی گرژ دەکرد...
ئەوەندە لە دەستی قرتاوی ژان دەترسای
بەرۆژ دەهاتە خەونت و
شەوان فتوای حەڵاڵبوونی مەرگی دەدای...
بەیانییەک کووچەکانی ئەم شەقامە
پڕبوون لە بوونەوەری جۆراو جۆر
هێڵەکانی دەکشاو دەکشا...
شەمەندەفەرێکی سپی بەپێی نازی
چارەنووسی گوڵە سوورە زەرد هەڵگەڕاوەکانی دەشێلا
کە ترس ڕەنگی بردبوون



شەو لە تاریکیدا گریا و
مانگ لە تارا سپییەکەی سەری وەڕەس بوو
رۆژ بەتیشکی گەرمی، جەستەی سپی خۆیی
دەسووتاند و
بەرەژووی ئەو سووتانە
سیمای ئاسمانی ڕەش دەکرد
چەم لە بێ ئۆقرەیی ئاو ڕابووەوە
کانیلەیەک لەتینووا گەروی وشک بوو
لە ئەلبوومی یادەوەرییەکانم ڕادەمام
وێنەی خۆم و هاوڕێکانم نەدەناسییەوە...
تۆ سەر بەهەرێمێک بوویت
ناویت نەدەزانی
وانەکانی قوتابخانەت بیر چووبووەوە
پیتێکی بارانت بۆ حونجە نەدەکرا
کات لە سوڕانەوەی خۆیدا...و
کاتژمێر لە خولانەوەدا وەڕەس دەبوو
گەڵای سەوزی درەختەکان.
بەچاو تروکاندنی ڕەشەبایەک
بە گژی یەکتردا دەچوون...
بایەقوشێک تەمەنی باڵندەکانی دەنووسی
کۆترێک بێچووەکانی لەئامێز دەگرت
من وتۆ و زەمەن و عیشق و شەقامەکان
لەگەڵ بیرەوەرییەکانماندا ناتەبا بووین

زستانان بەرگی هاوینەمان دەپۆشی...و
هاوین لەرز دایدەگرتین
بەهار چاوەکانمان دەنوست
تەنها خەزانمان خۆش دەویست
وەلێ ئەویش
نیگاکانمانی هەڵوەراند...
کوێ بۆ نیگا ڕژاوەکانم بگەڕێم؟؟



## گەمەکانی من و بیکاتشۆ

### بەشی یەکەم

زەردپەڕە و ئەندێشەم
لە هاتوچۆدا هەنگاو دەبیا...و
بەلای جەستەی کەنەفتی خۆرەتاودا تێدەپەڕێ و
لە سێبەری چنارێکدا دێت و دەچێ...
لەنێو پیاسەی شێتی ئەودا
نیگەرانی دەمخواتەوە و
یادگارە تاڵ و شیرنەکانم
دەمێک سوێر و دەمێکی دی مزر دەبن
لەم بوونەدا جوگرافیایەک نییە
خەونی سانایی ڕۆژگاری تیا نیشتەجێ بێت
ئسمانێ لەخۆی نابوورێ
بێچووە مەلێک فێرە فڕین کات...
ئەستێرەیەک ڕازی نییە...
شەوێک خۆر لە ژوانی بنوێت
دەریاچەیەک پێی ئەستەمە بۆ چەند ساتێک
ئاو ئیزن دا... و
دڵی بیابان لە کۆش بگرێت
وەرزێک نییە بەرگی وەرزێکی دی بپۆشێت.

ئاه... بیکاتشۆ تەنها من و تۆین
بەرگەکانمان یەک ڕەنگن و
خەونەکانمان بەیەک دەچن
ڕەنگە چارەنووسیشمان هەر بەیەک خامە و
یەک ڕەنگ نوونسرابێت
دەشێت سەفەرمان دوور و نزیک بێت
خەونم دیوەو چاوم دەفڕێت
خوایە بەخێری بگێڕیت
کات وەکو بیکاتشۆ دەڕوات
خۆشەویستیش لەگەڵ
لاشەی ئەودا دەنێژرێت
لەودیوی چرپەی دەنگەوە
وشەکانم باڵ دەکەم
دەنگی خۆم و جریوەی چۆلەکەکانی ناخی کەون
دادەمرکێنم
منیش وەکو بیکاتشۆ ژیانم خۆش دەوێت
وەلێ ڕۆژگار لێم ناگەڕێت
چاو ببڕمە دوورگەی دووری چاوەکانی... و
نیگا قووڵەکانی بدزم
لە ڕوخساری ورد ببمەوە و
دەستەکانی لەنێو دەست نێم
بەناخیدا شۆڕببمەوە...و
بەنێو خەیاڵیا ڕۆ بچم...



ژیان کە چاوم تێدەبڕێ
چاوی پڕە لە ئەستێرەی بێ ڕووناکی و
دڵی لێوە لەخۆشەویستی بێ هەست،
لێی دەڕژێت و من لێی ناگەم
ناخی پڕە لە پرسیاری بێ بەرسڤ...و
چاوەڕوانە بەرسڤێکی بدەمەوە
وەلێ منیش ئێزابێل ئاسا
خۆم لەوەڵامی پرسیارەکانی دەدزمەوە و
پێی دەڵێم: ئەمن بیکاتشۆ ناناسم
تەنها لە خەونێکدا بینیم
وەلێ یەکەم پاڵەوانە لەدەسپێکی چیرۆکێکدا
دەمرێت!

**بەشی دووەم**

ئەمە بە عەشق دەچێت و عەشق نییە
بەخۆشەویستی دەچێت و یەکەمین پیتی پساوە
تۆ دەنوویت و من لە شەستە بارانی نیگا
ساردەکانتدا
هەڵدەکورمێم،
نەچەترێکم لەئەویندا بۆ هەڵدەدەیت
نەعەشق دەکەیتە پێخەف و دامدەپۆشیت
ئاه بیکاتشۆ
خەونەکانم پچڕ پچڕن و بێ کۆتایی
لە خەونمدا تۆ دنیایت... و

من پەڵە هەورێکی سپی
وەشتە بارانی بەهارم بەسەر دڵتا داباراند و
هەر تێر نەبوویت
شەستە بارانی خۆشەویستیم بەسەر ناختا
داباراند...و
وتت با بێت
پەموە بەفری موحیبەتم
بەپەنجەرەی ڕۆحتدا دا و
پێت نەزانیم
ئەوەی هەست و نەست و سۆزە
لەتەک گۆشت و خوێنی خۆمدا
بەتۆم بەخشی وتت کوانێ
ئیدی تۆش لێم زویر مەبە
گەر کڕنۆشم کۆتایی هات و
پێم وتی:
ناتوانم خۆشم بوێی
فرمێسکەکانم دواییان هات
ئیدی فرمێسکی چاوی تۆم پێنابینرێ
لەم سەفەرە
گلێنەکانم چاوانیان بەجێ هێشتم
پیتێک نەما یا وشەیەک بەتۆی بڵێم
بیکاتشۆ لەخوێنم دایە و چڕنۆک لە زاکیرەم دەگرێت...
وەلێ هێندە شەڕانگێزە



لێ ناگەڕێ
چۆڕێ نیگا لەچاوانی بخۆمەوە
هەر شەوێک لەخەوندا دەیبینم
دەڵێم خێر بێ و سام دەمگرێت
بیکاتشۆ بڕیارم دابوو
هەتا گیانم لەبەردایە خۆشم بوێی
ئەوینم هەڵچوونێک نەبوو لەپڕ داچێت
باڵندەکانی جەستەمت بەتۆراوی سەرگەردان کرد
ئیدی مەڵێ کوێوە دەفڕێ
بیکاتشۆ دەزانم بێ تۆ بەژیان دەوترێ مەحاڵ
کەچی ڕۆژگار گشت چرکەیەک
قۆرتێک لەدڵما دەکێڵێ... و
عاگوڵی تێدا دەچێنێ
ئاه بیکاتشۆ
ئەم باسە کۆتایی نایە و
بەخوێنی دڵ دەینووسمەوە
دەڵێن لەگەڵ ئاهەکانمان بەدرێژایی ساڵ
بەملیارەها فریشتە جەستە بەدۆزەخ دەسپێرن، و
من بێ ئاگام
تەنها بۆی ڕەژووی ڕۆح و
هەڵقرچانی جەستەی خۆمم بەلووتدا دێت
لە دڵڕەقی تۆدا دەسووتێن
ئایەتەکانی عەشقم سووتان

دانەمرکایت
کەللەسەرم پوکایەوە
ئارامیت نەکرد بەسابات
تەمەنت ئەنفال کردم و
هۆشم پەی بەڕێگام نابات
دەسا فەرموو کوێوە بچم
تۆم بیر دەچێت
من نازانم ئەو ساتانەم خۆشدەوێت
کە لە شعورما سەوز دەبیت
یا لە ئیدراکم ون دەبیت
نا ئەم خەراباتی عیشقەم
لەدەستی زەمەنەوە دوورە...
نابینا بووم
ئەو دەمانەی جەستەی خۆمم دەکرد
بەڕەژووی دڵ
زاکیرەشم لەڕێی عیشقی
نابەجێی تۆدا پووکاندەوە
تۆش هەموو دەم
لە ئاشتی و تووڕە بوونتدا
پێت بەزەخمی دڵما دەنا و دەتگوت
میاو میاو... میاو
- توخوا کتە... کت بەسیەتی
هەڵمەزنێ بەو گوێسەبانە بەرزانە
بێچووەکان زاڵە تەرەک مەکە



با لەژین بێوەری نەبن
وەرزێکی دی لە تەمەنما تێپەڕی... و پێم نەزانی
جەستەی تەڕی درەختەکانم
لەنێو ئەم وشکەساڵەدا زەرد هەڵگەڕا و
هیچ بە(با)ی خەیاڵتا نەهات
شەپۆلەکان لەتینوواندا
سەریان بەتاوێرە بەردی قەدەردا دەکێشا...،
تنۆکێ ئاوی میهرەبانیت نەدانێ.
دەشێت تاقە دارستان نەبم
کە لەخەونی شوومی باخچەدا دەسووتێ
یا یەکەم گوڵەهەنار نەبم
بەناکامی هەڵدەوەرێت
یاخود یەکەم مرۆ نەبم لە سێبەری خۆی دادەبڕێت
ڕەنگە وەک ئەو گوڵەش نەبم پێش هاتنی وەرزی بەهار
بەدەست ڕێبواری سەر ڕێگاوە هەڵدەوەرێ
وەلێ چیرۆکی من و تۆ لە گشت ئەمانە سەختترە و
کەس تێیناگا
لە بێدەنگیم نوقم مەکە
هاوارەکانت دێنە گوێم
ڕۆژ بە دەوری من و خۆیدا دەخولێتەوە و
تۆ وەک خۆتی، نەچاوی عیشقم ماچ دەکەیت
نەتاوێکیش خۆشەویستیم ڕادەمووسیت
بیکاتشۆ کە هۆشم دەبات ئیدی نازانم چی دەڵێم
ئیزرائیل هێندە بەمەکرە

لەکاتی گیان کێشانمدا سیمای خۆییم پیشان نادات
دەمێ داوایی ڕوحم دەکات سەرتاپا بەرگی تۆ دەپۆشێت
لە مەبەستی وی تێناگەم...!
ئەو دەیەوێت ڕوخساری تۆ
لە نێو نیگای ڕوحی فڕیومدا تەڵخ بکات
یا دەیەوێت سیمای خۆیم لەبەرچاودا نەشێوێنی
منێک لەودیوی خۆمەوە
تەمادارە پەیامێکم
بەگوێچکەدا بچرپێنێ...
چیم بەگوێدا دەچرپێنێ
بیکاتشۆ هەردەم دەیەوێت
ڕەوتی ژینم پێ بگۆڕێت
شیلەی نەمامی حەزەکانم هەڵمژێت و
دوا پێکی شەرابی ئەوینم هەڵقوڕێنێ
گشت کاسەکانی ژیانی داچۆڕاند و بردی
گشت بەهەشتەکانی بەناوی خۆیەوە نووسی
تا لەو دنیاش باخچەیەک بۆ ئێمە نییە...
ڕۆژی لێ گۆڕین بە شەو و
شەوی کردین بەپێدەشتی بێ ئەستێرە
منی نوقمی ئەندێشە کرد
تاقە گوڵێکی لە گوڵزاری بیرەوەریمدا نەهێڵا
منیش بە ئەسپایی پێم وت:
تۆ بە مەزنی خۆتەوە...
زۆر ئەستەمە لەدڵما جێگات بێتەوە...



بیکاتشۆیەکم دەناسی هیچ پەیمانێکم نەدابوویە و
پێی دەوتم: بەهەشت لەژێر پێی تۆدایە!!
فریشتەکان لە پەنجەرەی ئاسمانەوە
گوڵاوبارانیان دەکردم
لەبۆنی عەتریان لەخۆ دەچووم
لە مەستیما بەکوڵ خەیاڵم دەگریا

## بەشی سێیەم

منێک لەودیوی منەوە تێم دەڕوانێ و
خەمێک لەودیوی منەوە باڵا دەکا
تەرزەکانی بەسەرما شۆڕ دەبێتەوە و
گەڵاکانی دامدەپۆشێ و
لە سیمای ڕەش داگەڕاوم ڕادەمێنێ
سەیرە زمانیشی نییە
کەچی بەچرپەوە دەڵێت:
تاکو دوێنێکەش قەزەم بووم!!
نا بیکاتشۆ گەر دەست نێمە دەستی تۆ
مێژوو قسەم لەتەک ناکاو
شیعریش ورتەیەک بەگوێمدا ناچرپێنێ
هاوڕێکانم لێ دەتۆرێن و
(نالی)م پێ ژیر نابێتەوە...!!
شەوێک لەخەوما بیکاتشۆ
وەک پشیلەیەکی نەوسن...
دانی لە ڕۆحم وەردەدا و خوێنی دڵم

بەلێویدا دادەچۆڕا
هاوارم کرد زارم بەسراو
کەس نەهات بەهانامەوە
شەوێکی دی لە خەونمدا...
هاتبوو گیانم بکێشێ...
بەخەندەوە پێم وت:
فەرموو بزانە
گیان کێشان بەدەستی تۆ چەند ئاسانە
بیکاتشۆ لەپاش جەنگێکی دووسەدەیی
توانی نەست و هەستم دیل کا
بچێتە ناو کەللەسەرم و فەرمان بەکردارم بدا...
سەیرە هەموو جەنگەکانی جیهانم بردەوە... و
ئەم جەنگەی بیکاتشۆم دۆڕاند
کە چرپەیەک دەنگت بەبیستنمدا دەهێنێت
ڕۆژەو دە جاران خەم
ماکیاژی لێوەکانم دەخواتەوە...
ئیدی نازانم (با) لەکوێوە هەڵدەکات و
چی وەرزێک باران دەبارێت
تۆ لەگەڵ هەموو ئاوازێکدا سەما دەکەیت و
بەو نوکتانە پێدەکەنیت کەوا ختووکەی من نادەن!!!
سەردەمێک دەزگیرانی باخچەیەک بووم
گەڵاکان بەشکۆوە تەماشایان دەکردم و
درەختەکان بەحورمەتەوە تێیان دەڕوانیم
لەپەنای ئەنگوستە شەوێکدا دەنوستم



بەئەمانەتەوە زەمی بەیانیمان دەکرد
ژیان لەزەینی مندا لەزەتی ماچێک نییە
لەلێوی تەڕی ئێوارەیەکی درەنگ وەختی بدزم
تریقەی پێکەنینێک نییە
ساتە وەختێک لە بێهودەییم قوتار کات
بڵێم ئیدی پێویستم بەفرمێسک نییە...
کۆترە سپییەکان هەڵفڕین
گەڵاکان بەدوایاندا کەوتن
نەفرەتم کرد لەو سێبەرەی جەستەمی کرد
بەتارمایی...
پاش دۆڕاندنی ئەم جەنگە نەمزانی ڕوو لەکوێ بکەم
چەند موسافیرێکی سەیر بووین
سۆز لە هەناوماندا دەڕژا و کیشوەرەکانی ئەوینمان
بەجێدەهێشت
سەیرکە چەن نامۆم بەم بوونە!!
مردووەکانیش گۆڕەکانیان جێ هێڵاو کەوتنە سەما
تۆ گۆرانیت بۆ دەوتن
تەنیا من نەبێ لەو گۆڕەپانە سامناکەدا
ڕیتمێکم نەبوو بۆ ژیان تا نۆتەیەک بۆ خەمەکانم دابنێم
سەما بکەن
تۆ ئاوێتەی جەستەی ڕزیوی ئەوان بوویت
بەڕوخساری شێواوەوە
گشتتان دەهاتن من بخۆن...!

## خەونە خێڵەکییەکانی بیابان نشینێ

باران تاو تاو
سەری ئەو درەختانە دەشوات
بۆ مەراسیمی ناشتنی ڕۆژگارەکان ڕێدەکەون
نەنکم بەپەنجە چرچەکانی
تەمەنی خۆی دەڕێسا
لۆچی ڕۆمەتەکانی دەخوێندەوە
دەفتەری سپی پرچەکانی دەپشکنی
تەنها ئەم دەستەواژەی تێدابوو
(ڕێسەکەم مەکەنە خوری)
من و لەتە مانگێکی ڕەشپۆش
کە هاتینە ئەم هەوارە پڕ تەلیسمە
دوو شاژنی شووشەیی بووین
زامی قەتماغە نەبەستووی سەدەکان
بە ڕوخساری تەلاییمانەوە نووسا و
پەرچەمی خەونەکانیشمان
لە ئاسمانە کریستاڵییەکاندا
دەشنانەوە...
دوێ شەو لە ڕوناکی ئەستێرەیەکی کزتر لە بیناییم
لە غیابی چراکاندا



دیرۆکێکم دەنووسییەوە
درکاندنی یاساغتر بوو لە پەیبردن بە ڕچە ڕێی
حەقیقەتەکان
بێدارتر لە چاوانی شەو
لە سووڕانی دوایین چرکەی کاتژمێرەکان چاوتێدەبڕم...و
زەمەن دەوەستێ
پێڕاناگەم خەونە خێڵەکییەکانی شەو
بکەم بەدەوار نشینی بیابانێکی بێ ئۆقرە
پێڕاناگەم شەونمی سەر ڕوخساری ئەو ساتانە
بسڕمەوە
پەشیمانی دوایین وێستگەی بێهوودەییانە
لە کەرنەڤاڵی ئەم ئێوارە مەرگەدا
دوایین کووچە و
دوا شەقامی خەونەکانم دەپشکنم
دەمێ دەبمە حوکمڕانی ئەفسانەیی شاری ئەوین
دەمێکی دی عەرشی عیشقم خاپوور دەکرێ...

## ڕاچەنینی ساتەکان

ئەو شەوانەی
گلۆپە کوژاوەکانی سەر شەقامەکانی گێتیم دەژمارد
(با ) فووی لە چراکان دەکرد
زەمەنێک وەکو من
جیا لەوان دەئاخافت
گەردیلەیەک بووم لەو ساتانە بەجێ مام
دواین وێستگەیان نەبوو بۆ چاوەڕوانی
ئای لە تێڕامانی
چاوی بێ ئۆقرەی کەنارییەک
دەمێ لە دوورگە سامناکەکانی
خەونەکانیدا هەڵدەفڕی...و
لە قولایی چاوی کوندە بەبۆکان ڕادەما
ئەو دەمانە
مانگ لەچاوی کچێکی ماتی ڕەشپۆش نامۆتر
دەیڕوانییە چاوی گەشی ئەستێرەکان...
ئاقارێکی چۆڵ
بارتەقای کەون پێکەنینی
ڕژاوی تێدا جێمابوو
دەستەکانم هێشوویەکیان نەچنیەوە
دەبوو ئەوان لەو ماسییە نوستووانە نەخۆن



کەوا قەدەر ڕێی نەدان
بەکراسە سەدەفێکانیانەوە
لەگەڵ ئاوازە خەمبارەکانی ئەو شەوەدا سەما بکەن
نیوە شەوێک
زەنگێک لێی دا و هێڵەکە پسایەوە
دەیان خەون و سەدان پرسیاری
لە ناخمدا بەجێهێشت
شەوگار چون بینابییەکانم زەق دەیڕوانی
لە خەونمدا پرچم درێژ دەبێتەوە و
تاڵەکانی
یەکە یەکەی شەقامەکانی شار دەماڵێت
دایە گەورەم لە گۆڕەکەی وەڕس دەبێ و
دێت لە ماڵەکەی ئێمەدا
گۆڕێکی دی
بۆ خۆی و باوکم چێ دەکات...
پشیلە ڕەشە بریقەدارەکان
بەپەنجەرە داخراوەکانی ژوورەکەدا هەڵدەزنان و
لەسەر ڕایەخەکانماندا
تەرمی بێچووەکانی خۆیان دەخوارد
زەنگێک لێیدا و
دەیان خەون و سەد پرسیاری
لە زاکیرەمدا بەجێهێشت
هەر ئەو شەوە لە خەونمدا
لە نێو تاریکی ئاسماندا خۆر هەلات... و

چەند ساتێک بەرلەوەی خەڵکی وەئاگابێت
ڕەشی پۆشی و لە چاو ون بوو
پانتاییەکان
چوون دڵی من لێوان بوو
لەتەرمی زیندوو
هیوای نێژراو
ڕستە خەمێکم بەدیوارەکانی هەتاودا هەڵخستبوو
تا چاو بڕکا درێژەی برد
وەکو شەقام
وەکو ڕێگاکانی سەفەر... بێ کۆتایی
ناتەبایی من و زەمەن لەو جەنگەوە سەری هەڵدا
لە شکستیدا کفنی مردووەکانی شەڕگەی کرد بە ئاڵا
کەڵەبابێک... زەنگی سپێدەی لێدەدا ڕادەچەنیم...
نەمدەزانی کام چارەنووس بەپەنجە درشتەکانی
تاری سپی سەری شەو هەڵدەداتەوە
ساتێ دێ تۆش ئۆغر دەکەیت
وەکو سەفەری کاتەکان
کەس ناڵێ ئۆغرت خێر بێت
زەمەن لە نیگەرانی دڵی ساتەکان
بێ ئاگا دەگوزەرا
لە پەیقینی ئێوارەیەکی مەلوول ناحاڵی
شەقامەکانی دەپێوا و
بە دەستارێکی ڕوشاو
خۆزگەی دڵی
ڕۆژگارەکانی دەهاڕی



## وەرزێک باخچەکەمان داناپۆشێت

کە هێشووە ترێی زەردەخەنەم
وەڕس دەبوو
دیوارەکانی ڕۆژگاری
دەکرد بەپەڵە...
نە ڕەزێکی وشکەڵاتوو
لەکینەی ئاگر دەگەیشت
نە چرایەک
لە سیمای ڕەشی شەو
سەری دەردەهێنا .
شەمشەمە کوێرەیەک دەیوت:
شەوان کە گێتی کوێر دەبێت
تێڕوانینم تەڵخ دەکات
ماسییەک لە بێگەردی ڕوخساری ئاو ڕادەما و
قسەیەکی بۆ نەدەکرا...
ئەو دەمانە کڵۆیەک بەفری سپی بووم
بە گژی پشکۆدا دەچووم
پاش چەند ساتێک
گەردیلەکانی جەستەم
لە ئاسمانێکی تەماویدا



بەسەر دڵی بیابانێکی لێو قڵێشاودا
دەباراند...
خۆ بیابانیش چوون دڵم
کۆڵوانەیەکی پڕ خەمی لەکۆڵدا بوو
خەیاڵاتێک نەهات دڵنەوایی بکات
بستێک لە خوار ئاپارتمانەکانی سەفاوە
ئەستێرەیەکی مانگرتوو مرد
پێکەنینێک بۆی نەگریا ،
هاورێکانی فاتیحەیەکیان بۆ نەخوێند
باخچەکەمان ڕووتبووەوە
وەرزێک بەسۆز داینەپۆشی...
سەیرە پەنجەی درەختەکان
لەگەڵ ئەم زریانە شێتەدا
چۆن هەڵدەکا
ئاو کۆچی کرد
کەنار نەیوت بۆ کوێ دەچیت...؟
سپێدەیەکی نیگەران
باسی عوزلەتی خۆی دەکرد
ئێوارەیەکی لەخۆبایی
قایل نەبوو
چرکەیەک گوێی بۆ شل بکات...
باسی ئەو عوزلەتە ناکەم مارکیز دەیلێت
من تەنهاییەک دەناسم



بێدەنگی دەدوێنێت و
چرپەی هەناسەشی نایەت
هەنگاو دەنێت
شوێن پێیەکانی دەسڕێتەوەو
کەسیش پەی بە ماڵیان نابات
کە پرچی (با ) سەمای دەکرد
کاتژمێرێک لێدانی دڵی ئەوی بۆ نەدەژمێردرا...
دوێنێ خەیاڵ
پەلکێشی ژوورێکی کردم
لە تەنهایی چەند ئەستەمە
ئەو دەمانە تۆشم هەبوویت
کە مانگ و خۆر
تاقانەی ئەم ئاسمانە بن
ئیتر بۆ نەوازش نەکەن
بەسەر گشت هەسارەکاندا و
ئیدی بۆ دەبێ لە من گومڕاتر نەبن
جیاوازی من وتۆ و باران لەوەدایە
تۆ فرمێسک لە چاوەکانتا
قەتیس دەکەی
ئەو لەناو دڵی هەورێکدا ڕایدەگرێ
من کراسی زەردەخەنەی لەبەر دەکەم
هەندێ جاریش
لەگەڵ ئاوازێکی خەمناکدا
دەیکەم بە گۆرانی

## پێکەکان بیریان دەچێت بمخۆنەوە

بەچرپەیەک دێیتەوە دنیای دڵم و
تەرمی ساڵەکان بەگۆڕستانەکانی
مێژوو دەسپێریت
ئاسمانی چاوی نابینام
لێو دەکەیت لە مۆمی داگیرساو
هەموو ساڵێک گەڵایەک
لەو درەختە ڕەنگاڵەیە دەکەیتەوە و
بۆ مەرگی ساڵێک
تنۆکێ ڕۆندک ناڕێژی
ئیدی چۆن داوام لێ دەکەیت
بڵێم گشت ساڵێک بەخۆشی...!!
کە تۆ هاتی
نە شەو مەیلی خەوی مابوو
نە ڕۆژ چاوی هەڵدەهات سەیری ئاسۆ'کات
کە سێبەرت بەلای شەوگاردا تێپەڕی
نیگەرانی ڕوخساری ڕۆژی داپۆشی
ئیدی بازێک بەسەر شانما نەنیشتەوە و
ئەستێرەکانی سەر پەنجەم
کوژانەوە و





شیعرەکانم لە تاریکیدا دەنووسی
سپێدەیەک بەجریوە
خەیاڵم پڕکە لە خۆشی
لە جێی خەمدا با بەخەندەیەک ئاوس بم
ئەوکات بەڵێنت پێ دەدەم
دانەکانم نەشارمەوە
ساڵ ڕۆیشت و
باڵندەیەک شوێن کۆچ و کۆچباری نەکەوت
شەو نییە کابووسە خەونێک
وەئاگام نەهێنێ
بەچرپەیەک دێیتەوە دنیای دڵم و
خورپەی ناخم دەهەژێنی
دەستەکانم پڕ دەکەیتەوە لە گوڵ و
چاوەکانم پڕ ئەستێرەی گەشی هیوا... و
ناخم پڕ کۆتری سپی خۆشەویستی...
نا هاوڕێ چیدی بەجوانی
ئێوارەیەکی نارنجی سوێندم مەدە
نەبا لە غرووری خۆمدا
ڕازی دڵی
چڵە نێرگزێکی ژاکاوم بیرچێتەوە...
گوڵەکان کە دەژاکێن نامرن،
لە خەیاڵی مەستی مندا
هەمیشە یاد دەکرێنەوە

سپێدەیان بەکام شەقام بڵێم دەخیل
لێرەوە دێت چاوت لێی بێ
بەکام خۆرە بڵێم هەورێک
لەژێر سنگتدا ڕابخە نسێ بکات
نەبا سیمای ڕەش داگەڕێت...
یا بەکام شنە با بڵێم
دەمێ دێت خۆت بشارەوە
نەبا لەنجەت ئاوێتە بەڕەوتی ببێ و
نەیناسمەوە
سەر پەنجەکانت پڕ کردم لەئەستێرە
وەلێ
دوورگەی چاوەکانم
ئاسمانێکی بێ ساماڵە
کاتژمێر دوانزە دەژمێرێ
چرکەکانیش لە حەژمەتا
دڵیان پەلەپەل لێدەدات
کات دەوەستێ و
پێکەکان لەبیریان دەچێت بمخۆنەوە
لەپرسەی مەرگی ئەم ساڵدا
منیش وەکو چرکەکان دەخولێمەوە و
پێم ئەستەمە بڵێم:
گشت ساڵێک بەخۆشی



## تابلۆکانی من و زەمەن لە هیچدا یەک ناگرنەوە

که ڕۆژ پێڵووی چاوەکانی
بۆ دوا سەمای ماڵئاوایی پەلکە زێڕینە دەگێڕا
چەند مەملەکەتێکی جیا جیا بووین
سارایەک بووین بەژو تاریک
بەتونێلەکانی فەنابووندا دەگەڕاین و
دژایەتی
مانگ و خۆر و ئەستێرە و
بارانمان دەکرد
ئەستەم و سەیرە
بوونەوەرە بچکۆلەکان
لە گەورەکان سڵ دەکەن... و
تۆ لە من و منیش لەتۆ و
هەردووک لە عیشق و بەختەوەری و ساتەکان
درەختەکانیش لە سێبەری یەکتر
ئاگر نەرم و نیانە
ئەو ساتانەی با توڕەی نەکات
ئاسمان بە هەمیشەیی ساماڵە
گەر تاریکی
بارگە بە ئەستێرەکان نەپێچێتەوە



من له سروه‌ی ڕۆحی
شه‌ماڵێکی شه‌که‌ته‌وه
به جریوه‌ی چۆله‌که‌یه‌ک و
به‌گۆرانی کوکوختییه‌ک
نهێنی کۆچی باڵنده‌کانم ده‌رک کرد
له سرووری با تێناگه‌م
ده‌مێ به‌ڕوومدا پێده‌که‌نێ و
له ڕازی دڵی تاریکی
که ڕووم لێ گرژ ده‌کاته‌وه
گه‌لێ جاریش
خه‌می ئه‌و ساته وه‌ختانه دامده‌گرێت
جۆلانه‌کانی خه‌یاڵم
سووک سووک خۆیان ڕاده‌ژه‌نن... و
نازانم، منداڵێکی بێ لانکیان له ئامێز نێم
یا بیانکه‌م به‌ژوانی بیره‌وه‌ری
نیشتیمانێکی دڵ ڕه‌نجاو
به کۆڵانه‌کانی به‌خته‌وه‌ریدا تێده‌په‌ڕم
ڕێکه‌وت نیگاکانم ده‌بات بۆ
سه‌ر ئه‌و شه‌قامانه‌ی
به‌هه‌ڵه یاساکانی بوونی تێدا داڕێژراوه
تاکو ئێستاش نه‌مبینیوه
ڕایه‌خێ بۆ وه‌نه‌وزی جووتێ چاوی ماندوو
خۆی ڕابخات



یاخود زه‌مه‌ن تاوێ
له‌هاواری خۆی بکه‌وێ
تا هێمنی بۆ گوێی وجود به‌رپا بکا
ئیدی چۆن سات به‌م نه‌مامی خه‌مه‌وه
ئارامی خۆی له‌ده‌ست نه‌دات...
کوێ بگه‌ڕێین
یه‌کسانی دابه‌شبوون ده‌بینینه‌وه...؟
شه‌و ده‌نوێت و
چرایه‌کی بێدار له‌وێ ئێشکگره
که مۆته‌که ده‌س ده‌نێته به‌رۆکی شاخه‌ونه‌کانه‌وه
په‌ریبیه‌ک
به‌به‌ر ماڵی خه‌ونه‌کانیا تێده‌په‌ڕێ
تێده‌فکرێ...
ده‌سته‌کانی
ده‌رگایه‌کیان بۆ ناکوترێ
زه‌مه‌ن له‌ودیوی منه‌وه
هه‌ر ساته‌و به‌ڕه‌نگێک
تابلۆکانم ده‌نه‌خشێنێ
نیگارێکم بۆ ده‌کێشێ
له‌هیچدا یه‌ک ناگرینه‌وه... و
بۆنی ڕۆحی یه‌کترمان
لێ نایه‌ت

# زەمەنێکە ڕەنگەکانم کاڵ دەبنەوە

ڕووبارێک بێرەدا دەڕوات و
دەریایەک ڕادەبوورێ
ئاوڕ لەسینگی شەقار بردووی
بیابان نادەنەوە...
کانیلەیەک لەسەر ڕێگامدا
هەڵدەقوڵێ
هێمنی ناخم دەشڵەقێ و
پەنجەکانم شەرم دەکەن
ڕوخسارمی تێدا بشۆن و
تەوێڵم فێنک کەنەوە
وشک هەڵدێم
دەڵێی وەرزی پێش بازانم
دەچمە نێو پێخەفی خەو و
بەبێداری دەڵێم:
شەو شاد
مۆڵەتی زاکیرەم بدە
تاوێک بەهێمنی بنوێ و
چەند چرکەیەک
بۆ تارمایی ڕوحی شەکەتم بگەڕێت





ئەز دڵنیام
لەتۆدا دەبیبینێتەوە
ئیدی نەگرمەی هەورە برووسکە
نە گۆرانی کوکوختیەک...و
نە سەدای شەوێکی بێدار
چرپەیەک
ناچپێنێتە گوێی وجود
ڕەشماڵێک لە دەردی،
خێڵەکێتی من و شەو و ڕۆژ بێ ئاگا
قەفەزێک،
لە ئاوازی غەمگینی گەرووی کەنارییەک
تێدەفکرێ
ئەسەف لە ڕیتمێکی ناگا...!!
کە زەمەن چاوم تێدەبڕێ
تابلۆکانم دەشێوین و
ڕەنگەکانم کاڵ دەبنەوە
ئیدی لەچاوی زەمەن و
سێبەری خۆم وەرز دەبم
لاپەڕەی ڕۆژژمێرێک و
ڕوخسارم لەیەکدی جیا ناکەمەوە
ساتە وەختێک
تیشکێک لەو پەنجەرەیەوە
خۆی ئەکرد بەم هەوارەدا

ئەمڕۆ لەدیدی دوێنێوە
پەردەی ژوورەکەم هەڵدەماڵم
وەلێ بوون ڕەش دەچێتەوە
من نازانم
شووشەی پەنجەرەکەم سیاهە...؟
یا نیگام تەڵخ دەڕوانێ...؟
یاخود ڕۆژگار بەخەمۆکی
هاتۆتە جێژوانم...؟
من و زەمەن
کە لەئامێزی یەکدی دەنووین
کاتژمێرێک لەنێوانماندا ڕادەکشێت و
جاڕی ئاوابوونی خەونەکانمان دەدات
وێنەی پەپوولەیەکی باڵ شکاوم
بۆ دەکێشێت
هەڵاژاوە بەسەر گوڵێکی سوورەوە
باسی کەنارییەکم بۆ دەکات
لە کەناری ڕووبارێکدا لە تینووا خنکا و
شەپۆل لە سەمای خۆی نەکەوت
پۆرترێتی... ڕۆحی شەوم دێنێتە یاد
لە دڵیدا ئەستێرە و مانگ ڕادەکشێنێ و
ڕوخساریان قەترانی دەکاو
پێژێ کێ لە من جوانترە...؟
ڕەزێکم پێدەناسێنێ



بەسوێراوک ئاوی دەدەن
کانییەکم پیشان دەدات
ئەو مروایانەی کە لە سنگیدا هەڵدەقوڵێن
لە دەستمدا دەبنە خۆڵ و
بەسەر جەستەی خاکدا دەڕژێن
ناوی ئاوێکم پێناڵێت...
جێی ماسییەکی شەکەتی تێدا بێتەوە
باسی چنارێکم بۆ دەکات
بەهار دێت ڕووت دەبێتەوە و
گەڵاکانی وەک پەرچەمم هەڵدەوەرێ
نیگەرانی کە خۆی بەناخمان هەڵدەسوێت
جەستەم پڕوشە هەڵدەدات
ئیدی نە ڕازێک بێزی دێ لەگەڵما بدوێ
نە هاودەمێکم دەوێرێ
دەرگای دڵیم بۆ بکاتەوە...
کات دەڕوات و من دەشڵەژێم
بەشوێن کۆچڕەوی باڵندەکان دەکەوم
بەجریوەی پاسارییەکان دەزانم دێیت
ئیدی نەتۆ ئاقاری چۆڵی
ئەم ڕوحەت پێ ئاوەدان دەکرێتەوە
نەمنیش چرکەساتێک
لەکۆشی زەمەن دەسرەوم

## ئەو ساتانەی
## بۆ سێبەری خەیاڵت دەگەڕام

سەرەڕێیەو جوانییەکان
بیرەدا دێن بۆم دەڕوانن
کۆترەکان
بەسەر دوا لقی سنەوبەرێکەوە
نیشتوونەوەو حەپەساون
کۆترەکانیش ئەو دەمەی
سێبەری جوانی بەلایاندا تێپەڕ دەبێ و
وشەی خۆشبەختی دەبیستن
وەک من دەگرین
دەگرین بۆ ئەو چۆلەکانەی
ئەو پەیڤەیان لا نامۆیە
خۆشبەختی
نەرمە پەنجەکانی
کە دەرگای داخراوی دڵم دەکوتێت،
گەرمەدەستەکانی
کە دەستی ڕچیوم دەگوشێت،
جوانە نیگاکانی
ئەو دەمەی لە سیمای پاییزیم دەڕوانێت...



وەلێ زۆر جارانیش
خەندەکانم دەکات بەخۆراکی گومان و
لەخۆڕا بەرسیلەی تەمەنی
ئەوینم دەوەرێت
ئێوارە ئەو چرکە ساتەی
چایی خۆشە لەنێو ئەم نەمامگەیەدا
نیگەرانی هۆشم دەبات
وەک زەمەنێکی شلەژاو
گوڵێک نییە ببدەم لە یەخەی باخچەکەم
هاوڕێکەم لێم دەپرسێت:
کام گوڵ جوانە بۆ نێو گوڵدانی ژوورەکەم؟
گوڵێک بەژنی چون خەم زراف
تەمەنی وەک عەشق درێژ
دەتۆش هاوڕێ
ناوی گوڵێکم پێ بڵێ هەڵنەوەرێت
ئالێرەشدا
من بۆنی گوڵم لێ نایە و
لە نهێنی وەهمی ئەم باڵانە ناگەم
کوێوەم دەبەن و
بیرم دەچێت
کە سەرکەوتم دابەزینی بەدوادا دێت!
ڕۆژێک ویستم لە خەیاڵی
ئێوارەکاندا بتسڕمەوە

سروشت بۆنی عەتری هەناسەی تۆی گرتوو
شەقامەکان بەدوی سێبەری خەیاڵت گەڕام
نەمدەزانی
لە چاوەڕوانی تۆیە
یان گۆدۆیە
شەو و ڕۆژ و ساتەکانم
بەبێداری دەسپێرم
ئیدی تەمەن بەشی شتێکی تر ناکات
لە قوتبی سەهۆڵبەندانەوە هاتم و
ڕێم هەڵە کرد
لەنێو خاک و ئاسماندا ڕامام و
ئیستێکم کرد
کە خۆر نوێژی خۆشەویستی بۆ دابەستم
من دەمزانی ڕۆژێک دادێت
بەتاسەی هەناسەی گەرمی
دەتوێمەوە و
دەڵێم جەخار لەو قەدەرەی وای لێ کردم
لە پۆلی حەوا و ئادەم بم



## لە میناى دڵتا مەمنێژە
## ئیدی گوڵە مینا ناگرم



لەمینای دڵتا بمنێژە
هەردەم گوڵە مینا دەگرم
لە دەریای مەنگی ناختدا
مەلەوانێکی شارەزام
یەک یەک وێستگە ئاوییەکان
دەپشکنم
ئاشنادەبم بەو ماسییانەی
مرواری ڕۆحی بێگەردیان
دەدەن لە زوڵف و پەرچەمم
ئەو ماسییانەی
بەخەندەی گریاناوی من وەڕەس نابن،
پێئەکەنن



بەویستی دارستان نییە
کام وەرز درەخت گەڵا دەکاو
چ وەرزێک گوڵ دەپشکوێ و کەی دەوەرێت
بەویستی باخەوان نییە
گەر دار هەنار
ترێ یاخود بەهێ بگرێت

بەویستی لاولاو خۆی نییە
تەرزی بەکام دیواردا هەڵزنێ
خۆ بەویستی منیش نییە
زەمەن لەکام پەنجەرەوە
خۆزگەکانی ناخم ببا و
لەدڵی سپێدەیەکدا
شاخەونێکم بتۆرێنێت
تا پێڵووەکانم لێک نەنێم
ئەستەمە چاوانت بنوێ...و
وەنەوز میواندارییان کات...
لە مینای دڵتا مەمنێژە
ئیدی گوڵە مینا ناگرم
نەخەم لە ئامێزم دەگرێت
نە لە دڵی گەورەی هیچ دەریایەکدا
جێم دەبێتەوە
سەرنجی بێهودەیم دە
تاکوێم دەبا و
لەکوێدا دەمگێڕێتەوە
لە مینای دڵتا مەمنێژە
چیدی گوڵە مینا ناگرم...
بیکاتشۆ،
کە تۆم جێهێشت
دەرگای بیستنم داخست و



پەیڤینیشم دوماهی هات
بەدەستێکم
تەنافەکانی ئەوینم دەهۆندەوە و
دەستەکەی دیم
دیوارەکانی موحیبەتی دەڕووخان
چاوێکم بانگی دەکردی و بۆت دەگریاو
چاوەکەی دیم دەتیرەنجان
کە پەیڤێکم لەناوەڕاستا دوولەت بوو
لەتی یەکەم
باسی سێو و شەرابی عەشقی بۆت دەکرد
ئەوی دییان
دۆزەخێکی لەناختدا بەرپا دەکرد
لەنێو دڵتا ئاگرێکی دادەگیرسان
ئەز دەزانم
خۆشم نازانم چیم دەوێت
تێڕامانە
لەنێوانی مردن و ژیندا
ڕەنگە تۆوی ئەو گوڵە بێت
کەزەمەنێک بێ ویستی خۆم
لە نەستمی چاند
سەردەمێک تۆم نەدەناسی
نەمدەزانی
عیشق چۆن لەدایک دەبێت و

کەینێ دەمرێت
بۆچی بەرگی ئاسوودەیی لەبەر دەکا و
بۆ دەگریەت
ڕێکەوت ڕۆژێک لەگەڵ ئاوێنەکەم ئەدوام و
بوم بەتۆ
تەرزەکانی هزرم قرتاند
شادەماری دڵم پچڕان
هەر ون نەبوویت
دواپەنجەرەی خەیاڵم بەڕووتا داخست و
کەچی ڕێگات بەخۆت نەدا
تاوێک لەبیرم دەربچی
ئیدی بۆ خەم نەمخواتەوە
نیگەرانی تاپۆم نەکات
گەر تا ئێستا بیکاتشۆ لەناخما دەژی



## تۆش وەکو خەم بۆنی عیشقی منت لێ دێ

گەڵاکانی تەمەن بگرە
بەدەم باوە هەڵدەوەرێن
کە مەرگ لە پەنجەرەکانی ئەودیومانەوە
دەڕوانێت و ڕادەبوورێت
شەرم دەمگرێت تاوێک لەگەڵ ژیان بدوێم
ئێمە دەنووین تا شاخەونەکانمان نەمرێت
نیوە شەوێک چوون یاسەمەن
دەڕژێیتە نێو گوڵدانەکانی تەمەن و ئینجانەکانی
خەیاڵمەوە
بێئۆقرەیی گەمە بە ئارامیم دەکات
دوورە پەرێز دەڕوانمە ئاهەنگی کۆتایی ساڵ... و
لەدایکبوونی ساڵی نوێ
هەموو ساڵێک ئەم دەمانە
گەمەم بە شادی و
پێکەنینم بەگریان و
گریانم بە پێکەنین دێ...
دەستا نیکۆلاس لێم گەڕێ
دوورگەی دووری چاوەکانم بە ئەشک بشۆم
لە تەنهایی ژوورەکەمدا
دوا قاوەی کۆتایی ساڵێکی دی ئەم تەمەنە بابردووە

بخۆمەوە
کوێوە بڕۆم خەم شوێن پێیەکانم هەڵناگرێت
ئەو دەمانەشی کە دەفڕم خەمی سڕبوونی باڵەکانم
لەکۆڵدایە
شەوان لەتاریکی خۆمدا
دەستم دەنێمە نێو دەستی تێڕامان و
بەناخی شەقامەکان شۆڕ دەبمەوە
هەرچەندە ناخیان تەی دەکەم
ئارامییەک نادەن لە بەرۆکی ساتەکانی بێهوودەیی
پیاسەی ڕوحی نامۆم درێژە دەبات و
کووچەو کۆڵانێک نامێنێ نەیپێشکنم و
بەدوایی نهێنی چرکەکانی ئاسوودەییدا نەگەڕێم
کۆڵانەکان دەمبەنەوە سەر یەک ڕێگا
شەقامەکانیش وەکو من لەگەڵ سروشتدا
دەجەنگێن
ناتەبایی خۆم و تۆ و سروشت و
ڕق و خۆشەویستیم بیردێتەوە
دەشێ پرسیارێک بێتە بوون
لە نیگاکانم ئاڵۆزتر
یا چی لوغزێک وەک گرێکانی دەروونم لێک دەئاڵێت
مەودای نێوان شیرینی و تاڵی چی پێدەڵێن
با بەچاو بگرین و بەدەم پێبکەنین
چاویلکەیەک چاوەکانم دادەپۆشێت
زەردەخەنەو گریانم ئاوێتەی یەکدی دەکات



گشت دژەکان لەمندا کۆدەبێتەوە
سەیرکە هاوڕێ چەند جوانە بەدەم گریانەوە
پێبکەنین و
ڕیتمێک بۆ ئازار دابنێین...
کە تۆ هاتی شانە هەنگوینەکانی گێتیت بۆ بریم
تەرزی شادی و خەم و عیشق و نامۆییم لێک ئاڵاند
تامی شیرینیم لێ نەچەشت
پێکێکی تاڵت بۆ پڕ کردم
من دەیان ڕاستی تاڵترم لەو پێکانە خواردۆتەوەو
سەرمەست نەبووم
گشت جەنگەکان لەمندا کۆ دەبنەوە و
ئێوارە درەنگ وەختانێ ناخم دەکەن بەمەنزڵگا ،
شەڕی نێوان دەست و پەنجەکانم،
شەڕی نێوان ئەبرۆ و برژانگم،
گشت دژەکان
لە تێکئاڵانی وەرزەکان و شەختەبەندانی زستاندا
لە ئارامگای دەروونم دەحەسێنەوە ،
هاوڕێ تۆش چون خەمیت
لەهەرکوێ بیت بۆنی عەشقی منت لێ دێ
دەڕژێمە نێو خەیاڵتەوە ،
بەسێبەری پەنجەکانت تاڵ تاڵ پرچم دائەهێنی
دەتۆش جارێک دەستەکانت بکەرە ملی خەونێکم
بەڵکو ساتێک زەمەن لەگەڵمان نەجەنگێ و
لەگەڵ سروشتدا نەجەنگم

## خاک و خۆڵیش بۆنی هەناسەی بەفر دەگرن

لەسەر دێڕی
یەکەم شیعرەوە دێمەوە
نێو ڕەشنووسی بیرەوەریم،
دەخزێمەوە
سووچێکی ئێوارەکانی بێدەنگیم
لەوێ ئەوان
تامەزرۆن بەبۆنی عیشق و بەختەوەری...
ئەمێستاکە
خاک و خۆڵیش ئاسوودانە
بۆنی هەناسەی بەفر دەگرن...
دوا شەو دەنووم
وەلێ لە کۆشی خەیاڵت نا
دەنووم بێ ئەوەی نیگات فێنکم کاتەوە و
هەناسەت باوەشێنم کا...
ساتێک بەرلەوەی
شەرابەکانی تەمەنم
بڕژێتە ناو
جامە بەتاڵەکانی عومرەوە
بەخوێنی غەریبی من





شۆستەو شەقامەکانی شارەکەمی دەشۆرد
هێدی هێدی
بەبزەیەکی سادەوە
پەیڤەکانی سەردەبڕیم و
وشەکانی لەت لەت دەکردم
بەرز دەفڕی
دەڕۆشت تاکو گەڵای تەمەنم
لەو درەختە ڕەنگاڵانە بکاتەوە و
ئەستێرەی بەختم لە ئاسماندا
جێ لەق بکات
منێک لە ئاوێنەی
ئێوارە تەنهاکانی ڕوحمەوە
لەڕوی ژاکاوی
سپێدەکانی عیشق دەڕوانم
پەنجەرە والآکراوەکانی مەرگ دەبینم
تنۆک تنۆک
دەڕژێمە نێو خەراباتی عومرەوە
خۆ لەمێژەوە هەر دەڵێم
متمانە بەقەدەر ناکرێ
ژیان خەمێکە لەوە قورستر
شانی بەیتە بەر هاوڕێ
چیدی لێوە بار گرتووەکانم
بەماکیاژی ڕۆژەکان سوورناکەم

نەبا دیسان
خونچە بگرێت و بوەرێت
نە لە شینایی چاوی دەریایەک
یاقوتەکانی ئۆقرەیی هەڵدەگۆزم
نە لە دڵی گەورەی
بیابانێکدا دەسوکنێم
لە ناخی تاریکی شەودا
بێ ڕایەخ و پۆشاک دەنووم
منێک بەپاشماوەی غوباری
زەمەنێکی چڕ دەچم
نەنیگاکانم دەگەڕێنەوە بەر ڕۆشنایی تیڕوانین
و نەپەنجەکانم دەدەن
لە دەرگای سپێدەیەک
نەقامەتم دەچێتەوە سەر
نەسلی ئەو چنارانەی
لەتاو عیشقی خواوەندێکدا
تاو تاو بەژنیان زراف دەبێت



## مەوسیمەکانی عیشق

مەوسیمەکانی عیشق وا بەسەردەچن
وەرە لەنێو دڵی گەورەی ئاودا
گەمەی ڕۆژانی
مناڵیمان دووبارە کەینەوە
دەمێک لێومان
بەلێوی پاراوی کانیاوێک
تەڕ دەکرد
گەرووی وشکمان بەبێگەردی ئاو
تەژی دەبوو
نەفامانە
بەردمان تووڕهەڵدەدایە
ئەو کانیاوەی
پێشتر لێمان دەخواردەوە
وەرە لەنێو دڵی بەردەڵان و شەپۆلە تووڕەکاندا
دەوارێک هەڵدەین
ئاشنابین بەو ئاوازانەی
سەما بەماسییەکان دەکەن
چون ماسی بەعیشق تەڕبین
کە تاقە درەختێک نەمابێ

لە ئامێزمان بگرێت
ئیدی بۆ ڕوحمان بەمیهرەبانی ئاو نەسپێرین
ئێمە عاشقانە دەڕۆین
مەستانە سەما دەکەین
من کە دەستی شەپۆلەکان دەگرم
وامەزانن نوقمی تەنهاییم
هەردەم لە بێڕەنگی ئاو و یەک ڕەنگی خوا
ڕادەمێنم
کە نەنکم سوێندی پێ دەخوارد
لە ناخی تۆ و سەرنجە شەرمنەکانت
ئەو دەمانەی چاو دەبڕیتە
دەرگای ڕۆژگار
من نازانم کەینێ
بێدەنگیم دێتە دەنگ
ساتە کورتەکانی عومر و
گەمە شێتەکانی عیشق بەسەر دەچن
گوێچکەو زاری ڕازەکانمان کەڕ و لاڵن
نە دەدوێن نە دەبیستن
بۆ ئێمەی سوار
گەمەمان بە پیادەکان دێت
بەتۆ چی تەلارەکانی ئەوین
کەنەشئەیەک بەڕوح نادات
بێ سوودە پیاسەی کەنار ئاو



گەر نەتوانم بەسەر ئاودا هەنگاو بنێم
گەر هەمیشە بەیەک چاو بڕوانمە بوون
دووچاوم ناوێ بۆ ڕوانین
با جامەکان پڕکەین لە عیشق
کەنار ئاویش لە پەپوولە
چەند جوانە سەمای پەپوولە
دەمێ بەدواییدا هەڵدەفڕم
بەرز دەفڕێت و نایگەمێ
وەرە ئەو دوورگانە تەی کەین
مرۆگەلێ نەیگەشتونێ
وەرە ئەو ڕەزانە ببڕین
زەردەواڵەیەک ناتوانێت
ژەهرە ماچێکیان تێ گرێت
دەستی ئەو چنارانە بگوشین
لە غوربەتدا دەڕوێن و
ڕێی نیشتیمان ناناسنەوە
تۆ ئەی ئەو کەسەی
قامەتت بەپێکهاتەی ناوم دەچێت
ئا لەو خەونەم ڕامەکەرەوە
لە تەمەندا جارێک دەبیینم
با زەرنەقوتەی ئەندێشەم
جیا لە من بڕوانێتە بوون
بۆ مەحکوم بێن هزرگامان
چوون یەکتر بێت

## غرووری ژنێکی شووشەیی

زۆری نەمابوو
دوا سرتەکانی تەمەن و
دوا چرکەکانی هەناسەی
بسپێرێت بە
شەوە نووتەکەکانی بوون و
زەمەنە جەنجاڵەکانی من
ئەم پیاسانە
پیاسەی عاشقێک نییە مەستانە
لە دوورگەکانی سەفادا خۆی ون بکات
غرووری ژنێکی شووشەیی نییە
لە شەمەندەفەرەکەیدا پرچی خەیاڵی با ببیا و بشنێتەوە
ڕەوتی دڵێکی نامۆیە
چاوبرکێ لەگەڵ یەئس ئەکا
فڕینی باڵندەیەکە
لە قەفەزە گەورەکانی بووندا
جێگای نابێتەوە
ئەی ئەو کەسەی
گەوهەرەکانی دونیای منت لێ دەرژێ
پەنجەرەیەک لە پەپوولە کوژراوەکانی دەروونم



بکەرەوە
وامدەزانی
بۆنی گوڵە مێخەکەکانی ئەوینمت گرتووە
هەینیەک چاو نابڕێتە ئەو گوڵە هەنارانەی
ڕۆژان کۆیان دەکەمەوە
تاریکایی نوقمم دەکات
لە لیتاوی هەناسەی خۆی
سەیر چەن تەنیام
بەمەلە هەڵەتەکانی بەربارانی
غوربەت دەچم
گوێسەبانێک لە خۆم ناگرێ
زەمەن پڕم دەکاتەوە لە
عیشق و تاریکی و نامۆیی
کێ وەکو من
تامی هەنجیرە تاڵەکانی ئەوینی کردووە
چەند عاشقانە دەفرم و
باڵندانە سەما دەکەم

# ئەستێرەکان نارژێنە نێو دەستەکانم

شەو درەنگان
لە پیاسەی تەنهایی ڕوح دەگەڕێمەوە
پیاسەیەک
بەڕەنگی عیشق و
بەخەندەی وەریوم دەچێت
سەیرکە چەند پڕم لە سۆز و
بەتاڵم لە بەختەوەری
نە شەو ئەستێرەکان
دەرژێنە نێو دەستەکانم
نە ڕۆژگار بەتریفە گەردانەی
پەلکە زێڕینەم بۆ دەچنێ
پیاسەکانم لەناخیاندا
گوڵە غوربەتیان لێ دەڕژێ و
هەموو تەمەن دەگێڕنەوە
بۆ غوربەتستانێکی چڕ
چیدی بەرگەی گەمەی
وەرزەکان ناگرم
سەیرکە چەند پڕم لە خورپە
بەخورپەی دڵی گوڵێک دەچم
بەبیانوی عیشق





دەستێک لە ژین دایدەماڵی و
ڕوح و جەستەی لەیەکدی جیا دەکاتەوە
زستان سەرم دەشوا و
بەتەڕی جێم دێڵێ
هاوین باوەشێنم ناکات
بەپەڕی وەنەوشەیەکی تەڕ
نەبەهار بەرسیلە دەکا و
نە پایزێک لە خەیاڵمدا گوڵ دەڕوێ
پێکەنینێکم نەبینی نەمداتەوە دەستی گریان
شارێک نییە پاش ئاشنابوون
نەمداتەوە دەستی غوربەت
زەمەن بە کاتم دەسپێرێت
شەویش دەمبەخشێت بە ڕۆژگار
گوڵەکانی ناخم دەسووتێن
وەرزێک دەستەکانی بۆ ناکات بە سابات
خەم نەما نەمکا بە لانە
شەوێک نەما پەنجەکانم
لە پشتی بێداری نەسوێت
سپێدەیان دەمکەنەوە
بەئارامگای بێئارامی
سەیرکە چەند پڕم لەسۆز و
چەند شەلاڵم
لە تێڕامان و بێدەنگی
هەناسەشم
بۆنی غوربەتی گرتووە

## تۆپەڵەکان گەمەیان بە بێزاریم دێ

سپێدەیان ڕوو لە سەوزایییەکانی
عیشقەوە دادەنیشتی
گوڵە ئەستێرەی ئەوینت بەسەردا دەڕژا
دەمە و مەغریبان لە پەنای
مێرگە وەنەوشەیییەکانی ڕوحەوە
ڕادەبوردم
پۆلە پەپوولەی خەیاڵت بە سەرپێڵووم
هەڵدەفڕین و دەنیشتنەوە
گشت وەرزەکان ئیرەیییان
بە گوڵی باخچە ئەفسووناوییەکەی خەیاڵم دەبرد
سەیرکە
گەڵای درەختەکان
کە ژەنگ دەگرن
چەند ئەستەمە
لەگەڵ پایز ئاشت ببنەوە
درەنگ یا زوو
ئەستێرەکانی ئەم عومرە هەڵدێنەوە؟
شەقامەکان
بەرد دەگرنە پەنجەرەی
تەمەنی بێدەنگیم



شۆستەکانیش
وردە زیخیان لێ دەوەرێ...
پەڵە پەڵە
هەورە بێگەردەکانم
دەسلەملانی تەمتومان کرد
تاوێک بەسەر درەختە عاشقەکانی بێشەکەمدا
میهرەبانی دانەباراند
لە نێو دڵی سپی ئەم بەفرە چڕەدا
تۆپەڵەکان
گەمەیان بە بێزاریم دێ
ئا لەودیوی شۆڕشەکانی خەمەوە
زەنگێک بە دەروازەی بیستندا
دێت و دەچێ...
نوقڵی ئەم جەژنە پیرۆزە
زاری تاڵمان شیرین ناکات
دارستانێکم نەبینی
لە شوباتدا
نینۆکی قەین
ڕومەتەکانی نەڕنیبێ
لە سووچێکی دیوارەکانی بوونەوە
وێنەی ئەو عاشقانە دەگرم
هەرزەکارانە تێکدەڕژێن
لەو دەمەوەی بەهار و خاک
ڕەگیان لە دڵما داکوتا
خەونەکانم بەبێ کۆتا وەئاگا دێ...

وەرە با دەس
لە نۆتەکانی ئازار و
لە سروودی گریان بەردەین
بەگۆرانییەکی غەمناک
چەپڵە بە دەستی لەرزۆکی
ئەم زەمەنە بدەینەوە
شەمەندەفەرەکان
بەفارگۆنی بەتاڵەوە
دێن و دەڕۆن
لەگەڵ ئەستێرەی تەمەندا
فریای سەفەرێک ناکەوم
دەشێت خەونەکانیشمان
وەکو سەفەری ئەم عومرە
یوتوبیابن
ئاخۆ کەینێ بە کۆچی باڵندە و
بەهەرەسی
چیا و بەرد و مرۆڤەوە
حیکمەتێکی نوێ
دێتە بوون
ئەمڕۆ لەگەڵ
دوایین هەناسەی بەفردا
جگەرەیەک دامدەگیرسێنێ و
چڕە دووکەڵی سووتانم
لە بەژنی درەختە
زرافەکان دەئاڵێنێ



## دوا نیگاکان لە وێستگەیەک لێک دادەبڕێن



بەسیەتی گۆرانی تەنهایی
ئێمە دەمێ ئاسوودە دەبین
بەیەک دڵ و یەک دەم و یەک دەنگ
پێبکەنین
ئەو ساتانەی سەماکانمان
لە ئاهەنگی غەریبیماندا ساز دەکەین
دڵنیابین
ماسییە تینووەکان
لە لێوی شەپولە توڕەکاندا
تینووێتی ڕوحیان دەشکێنن و
گەڵاکان لەگەڵ درەختەکانیاندا
ئاشت دەبنەوە
جەنگی سروشت و وەرزەکان
کۆتایی دێت
ئەو دەمانە ئاسوودە دەبین
دوور لە گەمەی بەرژەوەندییەکان
دەئاخفێن
وەرە
نیگاکانمان لێو ڕێژکەین

له جوانی و عیشق و بێگەردی
ئاخر گوڵم
ئەو دەمانە عیشق خۆشە
لە مەوسیمی خۆیدا دزە ئەکا
دوا لەحزەکانی تەمەن خۆشە
کەچی تەمەن کۆتایی دێ
ساتەوەختێک خەوشرینە
وەنەوز لە چاوان دەتۆرێت
بەخورپەن ئەو چرکانەی
بۆ بینینم دێت
لەوێ نیم
دێت لێت هەڵدێم
دێم تۆ دەڕۆیت
دوا نیگاکان لە یوتوبیای
نەهات و هاتدا
لە وێستگەیەک لێک دادەبڕێن .
ئەستێرەکان کە
چاو دەبڕنە چاوانم
لە شەوقی حوزنی نیگاکانما
دەکوژێنەوەو
سێبەری ئەم زوڵمەتە
چاوشارکێم لەگەڵدا دەکات
یەکەم جارە باخچەکەمان



وەرزێکی چون خۆی بناسێ
بۆنی گوڵە پرتەقاڵەکان
کۆڵانەکەمات مەست دەکا
درەنگە بۆ ئاشنابوونی
گوڵاڵە سوورە
بە بەهار
درەنگ کەوتم بۆ هەڵمژینی
بۆنی گوڵە یاسەمەنەکانی عیشق
و بۆنی
بخووری هەناسەت...

## زینەو نێرگزەکانی جوانی

نە ڕوخسارت بە بولێڵ و
نە چاوانت بە شەو دەچێ و
لە تاریکیم نوقم دەکەی
وەک تیشکی خۆر
لە جێی سپێدەیان هەڵبێیت و
لە مەغەریبیاندا ئاوا بیت
سەر لەبەیانی بنج شەمویەکی
ئازاراویدا
وانەکانت پەپوولە ئاسا
لە باڵیۆزخانەی قەدەر دا
بەدوای مەوکیبی حوزنتدا
پیت پیت گریان
تۆش بەسیمای پەری ئاساتەوە
چۆکت بەقەدەر دادەدا
ئاخر گوڵم
تۆ نێرگزەکانی جوانی بووی
یا گوڵە بەئیرادەکەی بەرشەرا
کەوا گریش
شەکرە بەفری خەندەی لێوەکانتی نەتواندەوە
ئاخر گریش





لەتاو عیشق و میهرەبانیت تێت دەئاڵاو
چەندمان پێ وت:
ساردو ئارام بیت بەجەستەت
تا دوا چرکەکانی سووتان
لە بیری کرد
بکوژێتەوە!

## لەنێو تەنهاییمدا بڕۆ

نەونەمامی زراڤی نێو بیرەوەریم
لە نێو تەنهاییمدا بڕوێ
بەڵکو تەرزی خۆزگەکانم
بە بەژنتدا بئاڵێنم و
تەرزی عیشقم
لە قامەتی شاتووی نامۆیی بپسێنم
لە نێو خەیاڵمدا بڕوێ
ئەندێشەم تەژی دەبێ
بەو وێنە شیعرە جوانانەی
خۆیان دەکەن بە شادێڕ و
گوڵی سووری ئێوارەکانیان
ئەدەن لە بەرۆکی سپێدەیەکی خەواڵوو
لە نێو خەونەکانم بڕوێ
سەدەیەک بە کپی دەنووم و
هێشتا ترسی وەئاگا هاتنەوەم
لێ دەنیشێ
لە تێڕوانینمدا خۆت بکە بە شەقام
با بە درێژی ڕێگاکانتا گەشتێک سازکەم
بێ کۆتایی



کە ماسییەکان لە جەنگی شەپۆل و
دەریا
وەڕس دەبن
تاسەیەکیان بۆ مرواریییەکان نامێنێ و
دەخزێنە تۆڕی ماسیگرێکەوە
لە چاوەڕوانیدا بێهوودەیە
ئیدی لەم زیندانە گەورەیەی
ئەم ژیانە ئازادەدا
چ ڕێگایەک بگرمە بەر
کە ناخم کۆیلەی عیشقە و بیرم ئایدیا
لەگەڵ بالیای خەمەکانم
بە چ ڕیتمێک
پەپوولەکانی دەروونم بێنمە سەما ؟

## ژیان دەمامک دەپۆشێت

لە نیشتمانێک دەگەڕێم
بە بوونم ئاشناکاتەوە
سارایەک نیگا کەمە بۆ ئاشنابوونمان
دەریایەک کینە ناتوانێ
بەر لە چاوشارکێی ئەوین و ئەندێشەی
ناخمان بگرێت
کە ژیان دەمامک دەپۆشێ
ڕوخسارێک چوون خۆی نانوێنێ
دەمامکی خەندە لەسەر خەمەکانم دەنێم
دەمامکی میهرەبانی
سەرپا جەستەت دەپۆشێ
وەرە تێکرا دەمامکەکانمان دامالێین
بەڵکو تاوێ سروشت چەشنی خۆی بنوێنێ
شوێن ترپەی پێی خیانەتی با نەکەوتم
کە لەنجەی بە تاڵەکانی پرچم دەکرد
بروام بە تیشکی خۆر نییە
دەمێک تێکەڵ بە مژوولەکانم دەبێ و
ڕەش و سپی ڕەنگی پەلکەزێڕینە دەگرێت
ئەو دەمەی هێشتاکە ژیان



دەمامکی نەدەناسی
تەرزی خەیاڵێکی نامۆم
دەئالاند لە بەژنی سپێدەیەکی عاشق
لە نێو درزی دیوارەکانی تەمەوە
ڕۆدەچوومە نێو
دیوارەکانی ناخت
لە ویَرا بەدووی
ئەندێشەی قووڵی بابردوومدا دەگەڕام
سالانێکە
بێ چرپە شوێن پێی وەرزەکانت هەڵدەگرم
شەونم ئاسا دەرژێمە سەر لێوەکانت
درەختانە گەلای سەوزی خەندە دەگری و
لێم بێ ئاگایت
وەرە تێکرا دەمامکەکانمان دامالێین
بەڵکو درەخت لە دەمامکی گەلا و
ئاسمان لە دەمامکی
ئەو ئەستێرە عەیارانەی
ناز بەسەر شەودا دەفرۆشن
ڕووت بێتەوە

## لە سەفەر دەگەڕێمەوە

ڕۆژگارێکە هەڵواسراوم
بە زنجیرە تەنافەکانی وەحشەتەوە
زۆر دەترسم
دەزووی باریکی ئەم ئەوینە بپسێت و
لە پردی سیراتی عیشقتدا گلۆر ببمەوە
لەم گەشتەدا خەونم دەدی خەون
خەونێک بڵاوتر
لە خەیاڵی پەرتی گەڕیدەیەک
هەر یەک لە ئەندێشە و دڵ و
جەستەم
لە شارێک بوون
تێڕادەمام داخۆ ئێستا
سەرم سەر بە کام هەرێمە
لە سەفەر دەگەڕێمەوە و تۆ لەوێ نیت
ڕۆیشتوویت و ئەدرەسێکت
لەسەر باڵی سپی
باڵندەیەکی کۆچەر بۆ بەجێ نەهێشتووم
ڕۆیشتوویت و
بۆنی لیمۆ کەسکەکانی عیشقت





بە تەرزی درەختەکانی حەوشەوە
پۆلە پەپوولەی ناخم و
سەری باخچەکەی مەست کردووم
تەنها نامەیەکی ماڵئاواییت بۆ ئەو
درەختە ناردبوو
کە سێبەری بۆ بەژنی ماچێکمان ئەکرد
سەیرکە چەند وێڵم
لە خەیاڵمدا شەقامێک نییە پێیدا بگوزەرێم
یاسایەک شک نابەم بۆ بنیاتنانەوەی ژیان
من دەزانم
سەفەر خەمێکی گەورەیە
ملی ڕێگا نادیارەکانم پێ دەگرێتە بەر
ئیدی چۆن ئاوێزانت بم؟

# ئەو

ئەو
جۆرە گوڵێکی کێوییە
لە چیمەنی حەوشەکەی دڵما ڕوواوە
سەوزایی مێرگ و ڕەنگ و بۆی
لە درەختەکانی سەر زەوی بڕیوە
چەندین ساڵە باخەوانی باخچەکەمان
لە ڕەگەوە دەریدێنێ
زەمەنێک لێم ون دەبێت و
گاهێکی دی
بە بەرچاوما سەر دەردەکا
پزیشکەکان لە تیمارکردنم شکستیان برد
گوتیان
نەخۆشییەکی کوشندەیە
بە نێو شادەمارەکانم دێت و دەچێت
کە بە بۆڕی هەناسەمدا دەگوزەرێ
پشووم تەنگە و
لێناگەڕێ ئاسوودانە
هەوای سەر زەوی هەڵمژم
جگە لە خۆی



بۆنی عەتری گوڵێکی دیکە وەرگرم
بۆنی خۆشی ژەهراوییە
ڕۆژێک بە ڕێکەوت(ئەوم) دی
ژهرە ماچێکی تێگرتم
لەو ساتەوە تێگەیشتم ژیان
گەشتێکی بێ مانایە
بەنێو سات و ڕۆژ و مانگ و سەدەکاندا
زانیم چیتر بە خەونیش
زەردەخەنە نارژێتە سەر لێوەکانم و
شادی لە درزی نیگاکانمەوە سەر دەرناکا
ئیدی بڕیام دا ببم بە هاودەمی تەنهایی
(ئەو) ئیرەیی
بە تەرزی گەڵامێوەکەی باخچەکەم دەبات
نازانێ بەژنی خۆی زۆر لەو باڵاترە
(ئەو) ڕکی لە دار هەنارەکەی ماڵمان دەبێتەوە
نەکا سوورایی بڕژێنێتە سەر لێوەکانم
(ئەو) دەریایەکی مەنگە
بە ئاستەم لێی نزیک ببیەوە
نوقمی نائارامیت دەکا
(ئەو) هەمیشە پێم دەڵێت
گشت سێوەکان بۆ تۆڕەوان
بەڵام بۆ ئەوانی دی نا
سەردەمێکە ئاوێتەی خەمەکانی (ئەو) بووم

دەترسم ڕۆژێک بڕوات و بەشوێن
خەمی کۆچیدا بگریێم
(ئەو) مرۆڤێکە بێ بەزەیی
لێزانانە
بەرەو دوورگەکانی ناخم هەنگاو دەنێت
تکای لێ دەکەم جێم بێڵێ
تیژ تر بەرەو کانگای دڵم
ئەسپەشێی هەنگاوەکانی تاوەدا
ئاشنای دەبم
ئەودەم سیمایم لێ ون دەکا
دەیەوێت هەمیشە
بە دووی سێبەری باڵایدا گەڕیدە بم
ئەو کە پانتاییەکانی هەزرم تاپۆ دەکا
لێناگەڕێ
بواری بیرکردنەوەم هەبێ
کە لە ئاسماندا دەدرەوشێتەوە
ڕێ ڕووناکی مانگ و ئەستێرەکانی دی دەگرێ
(ئەو) کە سەفەریش دەکا
ڕووحیانەتی لەناو دڵم و سێبەریشی
لەنێو ئەندێشەمدا جێدەهێڵێ
سەیرە ئاوێتەی یەکدی بووین
خۆز مانی پەیڤینیشمان لەیەک ناچێت
لە قەراغ دیوارەکانی عوزلەتەوە



بیر لە دەقێکی ئاسمانی دەکەمەوە
فەتوای مردنی عیشقت بدا
بیر لە چامەیەک دەکەمەوە
تۆ پاڵەوانی نەبیت و بیرۆکەی نووسینیت
لە هزرم دانەڕشتبێ
گشت پلانەکانی دنیام گرتە بەر
نەمتوانی تارماییت
لە نێو شۆستەکانی دڵم دەربێنم
کە بە شەقامەکاندا تێدەپەڕێت
دەرگاکان درز دەبەن و
پەنجەرەکان
گوێ بۆ ترپەی پێی هەڵدەخەن
نیگای شڵەژاوم نەبێت لە شەرمانا
بیری دەچێت تێی بڕوانێ

# وەرزکانی تەمەنم چوون نیشتمانم لەتە

لە غوربەتستانەوە دێم
مەپرسن خەڵکی کام شاری
هزر و هۆشم
چەشنی تێڕوانینم پەرتە
وەرزەکانی تەمەنیشم
چوون نیشتمانی داگیرکراوام لەت لەتە
بێهوودەییە ئەی عیشق
سانایانە دڵ دەشکێنیت
چ بێماناییە ژیان لە وەرزێکدا
گەڵای تەڕی درەختەکانی تەمەن دەوەرێنی
چوون ئەو ڕۆژانەی یەکترمان نەدەناسی
شەقامەکان چۆڵ و هۆڵن
ئەوان لە تۆ جوانتر سەمایان بۆ کردم
سەماکانیان لە دڵما لەنگەری نەگرت
نیگاکانیان
بەنێو دوورگەی چاوەکانم
دزەی نەکرد
من دەمەوێت
ڕەوتی ژین خێراتر بڕوات





کات سەفەر کات
ڕۆژ بارگەی بپێچێتەوە
گرنگ نییە تەمەن بڕوات
ئەگەر تۆم لە بیرچێتەوە
ئەگەڕێمەوە بۆ ژیان
گەر ئاسەواری بیرەوەریت
لە زاکیرەم بسڕێتەوە
دەگەڕێمەوە لای سەماکانی جارانم
سەردەمێک دەستی "با" م دەگرت
ئاوێزانی شەپۆل دەبووم
چوون ماسییەکان لە دەریادا
بە بێ ئاگا سەمام دەکرد
دەشێ پرشنگی نیگات
تیشکی درەوشاوەی ئەستێرەی
شەوگاری ژیانم بێ
وەلی ناکرێت
بە ڕۆژ خۆر و بە شەو مانگ
دەزگیرانم بێت

## کەشتی عومر بێ سەوڵ ڕێ دەگرێتە بەر

ئەگەر ژیان
خۆزگەیەکی نەهاتووەدی بێت
لای من عیشقێکە پایزیی
ئەو دەمانەی گشت بەهاکان هەڵدەوەرێن
شەرمی لەدایکبوونێکی دی دامدەگرێت
بێهوودەم
لە بیستنی ئەو گۆرانییانەی
بەتێکڕای دەنگ
بۆم دەچڕن و
تۆ لە قەتیس بوونت لە خەمە یەئسێکدا
بیرت دەچێت بیانچڕی
ئەو دەمەی لە چاوەکانت
تینووی چۆڕە نیگایەکم
لە نهێنی تاسەی ڕێبوارێکی سەرەڕێ ناگەیت
لە بیابانێکی چڕدا
ڕێگاکانی لێدەگۆڕێت
ئەو ساتانەی
تینووی عیشقی دەریایەکەم
ناپرسی لە کەشتی عومرم



چۆن بێ سەوڵ و بێ ناخودا
لە ناخی شەپۆلەکاندا
ملی ڕێگا
دەگرێتەبەر
کووچە و کەلەبەرێک نەما لە بوون
بەدووی خۆم و
ئایدیا و بیرەوەریم نەگەڕێم
سات لە دوای سات
درەختەکانی نامۆبوون لە مندا چرۆ دەکەن
وەلێ ناگەم
بە نهێنی نامۆبوونی
ئەندێشە و زاکیرە و جەستەم
کە شەوگارت لە تاریکی نوقم دەکرد
من لە سەرابم دەپرسی
دەشێ بێ ڕووناکی مانگ و ئەستێرەکان
جارێکی دی
ڕۆژ بتوانێ هەڵبێتەوە
چەند ئەستەمە لە غوربەتدا
کۆشی گەرمی نیشتمانت بیرچێتەوە

## له بێدەنگیمدا دەنگ دەڕژێت

دەمێک ئەوینم لێدەڕژێ
هەرساتە و ژانێک
هێشووە ئازاری نامۆیی
بەسەر پەڕەسێلکەکانی ناخم دەبارێنێ ... و
تۆ سەدای دەنگم نابیستی
له بێدەنگیمدا دەنگ دەڕژێ و
له سەدایدا کپی و مەنگی
بەسەر جەستەم گوزەر مەکە
برینەکان بەدووی قەتماغە دەگەڕێن
هەر ڕۆژە و عیشقێکم دەمرێ و
خەم له دڵمدا دەواری
خێڵەکییەتی خۆی هەڵدەدا و
منەتبارم دەکاو دەڵێت:
شادبە ئەی دۆست
وەرە نزیکترین هاوڕێم
دڵنیابە بۆ ساتێکیش
جێت ناهێڵم
برۆ ئاپارتمانەکانی عیشق و
سەوزایی دڵم جێبێڵە



زەمەنێکە چاوەڕوانی کۆچی دوایی
ئەم عیشقە لەناکاوەم ... و
گوڵە گەنمی خەمەکانم خەرمانەی دا ... و
له پانتایی دەروونم دروێنە ناکرێ .. و
سووتەمەڕۆی
گشت دەم جەستەم دەسووتێنێ
هەزار بریا
وەک خۆری زستان ئاوابی
له ژینمدا تیشکم ناوێ تاریکایی دەپەرستم
ڕۆژگارێکە تەمادارم بیرەوەریت
له ئەندێشەی خەم بردوومدا بسڕێتەوە
بێ عیشقی تۆ با بەڕوومدا هەڵدەکات و
گوڵە سوورەکانی ناخم دەشنێنەوە
برۆ چیدی با هەنسک و تاسەی عیشقت
بە ناخمدا دانەچۆڕێ
هەناسەی گیانکێشانێکە
له کاتی گیانەڵادا دەمهێڵێتەوە و
جێم دەهێڵێ
ئەمە سێوەکەی ئادەمە
نا هاوڕێ فریوم مەدە
خۆ نیگا سیحراوییەکانت
تەماداره بەناوی عیشقەوە
خیانەتم له گوڵ پێ بکا

## بێدەنگی

بە ڕێکەوت دێیتە سەر ڕێگام
بە ڕێکەوت دێمە دیدارت
جێ ژووانەکان چۆڵ و هۆڵن
چرپەی مەلی لێوە نایە
گەڵای تەڕی درەختەکانت
گوڵاویان لێ دادەچۆڕێ
من بۆنی عیشقم لێ نایە
نیگام بێ ویستی ڕووانینم
لە دەرگای تێڕوانینمەوە
جار نەجارێک دزە دەکا
هێندە تیشک بارانم مەکە
با خەمانم لە خۆبایی تر خۆ نەنوێنن
کە بێدەنگی باڵ دەکێشێ
بەسەر زمانی پەیڤینم
تاکە پەیامێک نامێنێ
لە دەرگای کلۆمدراوی بەرسڤدانم نەدا
من لە پشتی گەڵای درەختەکانەوە
خۆم لە سێبەری درەختەکان دەشارمەوە
هەروەک چۆن لە پشتی تۆوە





خۆم لە سێبەری نیگایەکت دەشارمەوە
بێدەنگی لێم ناگەڕێت
بە تەرزەکان بڵێم سپێدە باش
چ جەنجاڵییەکە ژیان
پێدەچێت مرۆڤەکان لەناو
کەللەسەری مندا دەدوێن
بێدەنگی ڕێم پێ نادا
لە شەرابی پێکەنینا نوقم ببم
بێدەنگی وەرزێکی نەهێشت
بە زویری جێم نەهێڵێ

## له نێوانی عیشقی تۆ و ئەودا

له نێوانی عیشقی تۆ و ئەودا
ڕچه ڕێگایەکم دەوێت
دەستم بگرێ و بمباتەوە
بەرەو کووچەکانی ژیان
عیشق هێدی هێدی دەیبردم
تا ئەو دەمەی لە زەردەخەنەی تاساوی
نیگایەکی سارد و سڕیا نووقم نەبووم
نەمزانی چەند کوشندەیە
له نێوانی ڕۆژ و شەودا
کام کیشوەر بۆ خۆم بگەڕێم...؟
هۆشم پەی بەوە نەدەبرد
مامزە سرکەکانی ئەندێشەم
لە بێشەیەکدا دەپێکرێ
لێی نووسراوە ڕاو بڤەیە
له نێوانی عیشقی تۆ و ئەودا
یەک زارم هەیە بۆ پەیڤین
به چی زاراوەیەک بدوێم
لەنێو ئەم دوودڵییەدا
من نازانم



ئاگر و ئاو
کام بەجەستەم ئارامترە؟
دەشێت عیشق
گەمەکردن بێت بە ئاگر
ئەوەتا ئێستاش
جێی چزووی پەنجەکانی
بەسەر جەستەمەوە دیارە

## لەودیو پەنجەرەکانەوە

لەودیوی پەنجەرەکانەوە
بۆ سێبەری بالآت دەگەڕێم
ئاسمانی شین
بەفری بێگەردیم بەسەردا دەبارێنێ
ئاسمانی چاوی تۆ عیشقی لێ دەبارێت
کە پەیکەرت بەڕوومدا دێت
هەڵدێم ئازیز
نەبا دیسان
نیگات ڕێژنە بارانم کا
لێم گەڕێ با لەپاش هەڵوەرین بپشکوێم
پاش گیانەلآ وەختە زیندوو دەبمەوە
عیشقم چنارێکی ڕووتی بێ سێبەرە
نسێ بۆ ڕووحی شەکەت و ماندووم ناکات
لە یەکەم و دوا وتەمدا
دەبوو بلێم خۆشم دەوێی
کە وەرزێکیت لە وەرینی گەڵای
درەختەکانی ناخم بێ ئاگا
بۆ بەشوێنما دەگوزەرێیت
لە نیگەرانی و بێزاریم دڵگیر مەبە



من نەوازش بەسەر هەسارەیەک ناکەم
لە دڵما خۆی چێ کردووە
تۆوی عیشقێکی ئەبەدی ناشۆمەوە
لە ناخمدا ڕوواوە و چرۆی کردووە
کە بە ئاسماندا هەڵدەفڕم
مەلی عیشقی تۆی لێ نییە
نامۆترم لەو بێچووەی
ڕەوە مەلێک جێیدەهێڵێت
تەنهاترم لەو ئەستێرەی
لە هەسارەکان دادەبڕێت
لە ساتە خەمبارەکانی وەڕسبوونم دڵگیرمەبە
بە وڵاتێک نالێم غوربەت
لە ئامێزیا خۆم گرتەوە

## دوور له چاوشارکێی منداڵی دەستی خەیاڵێکم بگرە

گەڵا گەڵا دەوەرێمە سەر
یادگارە سەوزەکانی دوێنێکە و
نمە نمە دەڕژێمە سەر
لێوی حەزە قڵێشت بردووەکانت
دەلێم گەرێ
با لاولاوانە هەڵکشێم
تا تەرزێکم بئاڵێنم
لە گەردنی ئەستێرەیەک
گوڵێک نییە بەو وەرزەم ئاشناکاتەوە لێت دابڕام
خەونێک نییە بمگێڕێتەوە
ئامێزی ئەو بەفرە بێگەردەی
لە بەستەڵەکیا پەنجەکانم مەیی
ئەمێستاکە
دوور لە چاوشارکێی منالّی عیشق و
دوور لە سەوزایی مێرگی سینگت
وەرزەکان یەک یەک ڕەت دەکەم و
لە تەمتوومانی ژیاندا
چاوی خەواڵووی حەزەکان
لە ئاستی سێبەری بەژنتدا دائەخەم



نیگاکانت ڕێی دۆزەخم پێ دەگرنە بەر
لە نهێنیی هەنگاونانم بەرەو ئەم دۆزەخە ناگەم
خۆ باخچەکانی ئیرەمم لێ نزیکترە
لێمگەڕێ ئەهریمەنی هاوڕێم
بەرەو ئەو دوورگە تەلیسماوییانە پەلکێشم مەکە
با چۆڕێ لە عیشقی خواوەند و
زەردەخەنەی سەر لێوانی
ساتەکانی بەختەوەری بخۆمەوە
سوێراوکی ئەم فرمێسکانە
ژێی گیتاری گەرووم دەپسێنێ
گمەی کۆترەکانی ناخم بێدەنگ دەکا
زەمەنێکە لەبەر دەرگای کلۆمدراوی
یادەکانت دێم و دەڕۆم
نەگەشتمە هیچ
لە وێستگەی چاوەڕوانیدا
خەیاڵ دەستێکم دەگرێ و
تۆ دەستەکەی دیم
تا کوێ بەشوێن پێی هەنگاوەکانتان بڕۆم !

## ڕێکەوت

مانگێکی درەوشاوە نیم و
ئەستێرەکان بەدەورمدا دەخولێنەوە
هەنارەکانی حەوشەکەم
لە ئیرەییدا شەق دەبن
وەلێ هاورێ
نامەوێ سەر پەنجەی حەزێکت بگرم
گەڵا سەوزەکانی تەمەن
ڕۆژ بە ڕۆژ لە هەڵوەریندان
کەچی هێشتا چاوەڕوانی ڕێکەوتێکم
ساڵەو جارێک
گوڵە مێخەکی هەناسەت
بڕژێنێتە سەر ئەو شەقامەی
ڕۆژان پێیدا دێم و دەڕۆم
ڕێکەوتێک تیشکی نیگایەکت
بگرێتە دوورگەی
چاوی گەشی ئومێدێکم
ڕێکەوت جوانترین دیاری شەقامە
بۆ درەختەکانی سەر ڕێگا
موژدەی هاتنی بەهارە
بۆ باڵندە ڕووح تەریوەکان





ڕێکەوت ساکارترین ئەوینە
بیابانی دڵم دەتەنێ
شنەی شەماڵێکی ساردە
دەمەو نیوەڕوان بەڕوومدا هەڵدەکات و
گەرمەسێرەکانی عیشقم
بە ئێوارەیەکی فێنک ئاشنا دەکاتەوە
بیرتە یەکەم جار پێم وتی
با گوڵەکانی دیدارمان
خونچەی ڕێکەوتە سادەکان لە بەرۆک دەن
وەلێ گشت دەمەو ڕێکەوتێک
خۆم لە تیشکی نیگاکانت دەدزمەوە و
لێناگەڕێم نیگایەکم بڕوانێتە
زەردەخەنەی ڕژاوی سەر لێوەکانت
لێمگەڕێ با ئەو ئێوارانە لە یادکەم
سپێدە ناناسنەوە
ئەم ماچانە
بۆنی مەرگی عیشقیان لێ دێ و
بە لێزمەی بارانی خەم دەمشۆنەوە
تەرزی ناخم لە نامۆیی و
نامۆیی لە جەستەم دەسوون
لێمگەڕێ
با ڕێگا
لە ڕێکەوتیش بگرم
زەمەنێکە لەبەر پێی ڕێکەوتەکان هەڵدێم
لە سەفەری تەمەنێک دەگەڕێمەوە

تۆی بۆ دەڕۆیت
دەمێ ڕێکەوت شنەبای هەناسەیەکت
بەڕوومدا دەهێنێ لەخۆ دەچم
دەڕوانمە کۆترەکانی هەناسەم
چۆن لە ئاسماندا هەڵەتەن
چۆن نیگاکانم ڕابێنم
بەبینینی پەیکەری باڵات نەشڵەژێ
بەشادەمارەکان بڵێم
بەڕێکەوت هاتە سەر ڕێگات
مەهێڵە خوێنم هەڵبچێ
لە نێو دەریاچەی خەیاڵم شەپۆل دەدەی
ئەندێشەم تەژی دەبێ
بە تاسەی دیدارێکی شەرمن
کە بە تەنیشت سێبەرمدا تێدەپەڕی
ڕێکەوتەکان دڵم دەهێننە خورپە
خەم پێم دەڵێ
خوا دەس بەباڵاتەوە بگرێ
شۆفێرێکی بێ ئاگام لە یاساکانی ڕێگاوبان
دەفێرم کە
با نیگاکانم ڕابێنم
بە بینینی پەیکەری باڵات نەشڵەژێ
کە بە شەقامەکانی عیشقمدا گوزەر دەکەی
گەڵای درەختەکانی ناخم هەڵنەوەرێ
چۆن سۆماکانم ڕابێنم
بەرگەی نیگایەکت بگرێ



## ئەمێستاکە جیام لە دوێنێ

جیام لەو ساتانەی پەیکەری ڕۆژەکانم
بە پۆرترێتی شەو دەچوو
شەوگارێک ئەستێرەکانی
لە خەڵوەتگای قەدەرەکانیا
مەست دەبوون
مانگی وێڵیش
لە ترپەی پێی ساتەکاندا
ڕادەچەنی
خەمێک هەمیشە دەمبات و دەمهێنێ
ئەوسا ڕەش و
دوێنێ شین و ئەمڕۆ مەیلەو پەمەییە
بەژنی هەندێ باریکتر لە ڕابردوو خۆ دەنوێنێ
لەودیو سنووری ئازارە بێ کۆتاییەکانەوە
یەکدیمان بەو دڵۆپە فرمێسکەوە بەجێ هێشت
کەوا قەدەر لە چاوانمان قەتیسی کرد
ڕۆژێک لە غوربەت دێیتەوە
پەیکەرت بە دارچنارێک دەچێت
لە بیاباندا ڕووابێت
گەردەلوولیش

گەڵای بێگەردی ڕووتی هەڵوەراندبێ
دڵم بەو سارایە دەچێت
لە هیچ وەرزێکی تەمەندا
میهرەبانی نەبینیبێ و
بارانی سۆزی بەسەردا نەباریبێ
لە وێستگەی ئەم تەمەنەدا
دەیان شەمەندەفەرم
بە فارگۆنی بەتاڵەوە بەڕێ کرد و
بە هەزاران ڕۆژگارم بە یادگار بەخشی
ئەمێستا جیام لەو ساتانەی
خەمەکانم یەک ڕەنگ بوون و
ڕوخساریشم زەعفەرانی
ئەمڕۆ خەمانم نارنجین
وەک ئەو منداڵە بزێوەی
دەمێ گەمە بە گۆی مەمکی دایکی دەکا و
دەمێکی دی پێدەکەنێ و
تاوێ دەگری
لە سەفەر دەگەڕێیتەوە
ڕوخسارت چوون خۆی نامێنێ
غوربەت جوانییەکانمان دەبا و
چرکەساتی ئارامیمان پێ نابەخشێ
سەفەر خەونێکە کە دەیگەینێ
لێومان دەکات لە بێزاری



## بە پێکێک دەڵێم بمبوورە ناتخۆمەوە

لێمگەڕێ هاوڕێ لێمگەڕێ
پۆزش بۆ مەفتەنەکانی عیشق و
بیرەوەریت بێنمەوە
بە شەو بڵێم
گەمەکردن لەگەڵ پەڕەی
وەریوی گوڵ ئەستەمە
خەون بینین بە دارستانەکانی عەدەمەوە
سەراپا جەستەم شەلاڵی خەم دەکا
لێمگەڕێ
بە پێکێک بڵێم بمبوورە ناتخۆمەوە
مادامەکی خەمی دەیجوور مەستی کردووم
بە درەختەکان بڵێم
ئەمساڵیش وەرزی ڕووتبوونەوە بەسەرچوو
بە بیرەوەرییەکانت بڵێم ماڵئاوا
بە بەرچاوما بگوزەرێ تاسەت ناکەم
بە هەنگێکی شەکەت بڵێم پشوو بە
وادەی فریودان نەمەنەن
هەنگوینەکانت لەو دنیا دەخۆمەوە
دووربە لێم هاوڕێ

دووربە لێم
باڵندەکان پێم دەڵێن خەمت لێ نایە
جەستەت بدە پەرییەکان و
ڕووحت بە من
ماچەکانت بۆ خۆت بەرەو
ناخت بۆ من بەجێ بێڵە
تۆزقاڵێ نیگام بەسە
هەزارەیەک سەرمەستم کا و
بە پێکێک بڵێم بمبوورە ناتخۆمەوە
یادگارەکان گۆشیان کردووم
کە عیشق خۆراکی ڕووحە
بۆ ناخ پێی شەرمە بیدرکێنێ؟
نازانم بۆ کۆترەکان
گوێسەبانەکانیان بەجێدەهێڵن و
لەسەر باڵی چۆلەکەیەکی شەل سەردەنێنەوە
چەشنی خۆرت لێ هاتووە
شەوان دەس لەملان خەوی و
سپێدەیان نەوازش بەسەر ئاسماندا دەکەیت و
کەس لە غروورت تێناگا



## تەمەن ئەوەندەی نەماوە
## تا لە تەنهاییمدا بڕوێی

ڕەنگە تەمەن
چەند چرکە ماوەی نەمابێ
تا لە تەنهاییمدا بڕوێی
گوێم لە چرکەی کێلونی دەرگایەکە
خۆی واز دەکات
دەشێ بییەوێت
نامۆییم لە ئامێز بگرێت
بە ئەسپایی دەڵێت بنوو
نیوە شەوە
کەی وادەی حەوشە شۆڕینە
تەڕایی ئەو دەرەختە وشکانەم لێ دەچۆڕێت
لە تینوواندا باوەش بەو دیوارانەدا دەکەن
عیشق لە بنەڕەتیدا کۆنکرێت کراوە
من کچی بیابانێکم
گەر ساتێک لە خەم داببڕێ
دەڵێ ئەمشەو
لەسەر چی سەر بنێمەوە
هاوڕێکەم چامەیەکی ون کردووە
مانگێک ژانی بەلەدایکبوونییەوە گرت

پێم وت خوا سەبووری خەمت دا
ژیان ئەو شەمەندەفەرەیە هەر دەمبات و
لێناگەڕێت
لە ڕێگا درێژەکانی سەفەردا
لە وێستگەیەک نووچێ بدەم
ژیان برادەرێکە لەگەڵی دەدوێم
زەنگێک بۆ مۆبایلەکەی دێت
لەسەر هێڵەکانی چاوەڕوانی دەمهێڵێتەوە و
بە وەڵامدانەوەی کەسێکی دی سەرقاڵ دەبێت
ژیان ئەو چرکەساتەیە دوور لە تێفکرین
قاوەیەکی بە شادی تیا دەخۆیتەوە
جگەرەیەکی خەمبار لەنێو پەنجەکانمدا
چرە دووکەڵی نزاکانی
ئاراستەی ماڵی خوا دەکات
هەمیشە تاسەی کێشانی جگەرەیەک دەکەم
پێم دەڵێ مەمکێشە
با لە چرە دووکەڵی سووتانمدا
سیمای مانگ و ئەستێرەکان
ڕەش دانەگەڕێت
کە پێکەکان تاسە دەکەن
بڕژێنە سەر لێوەکانم
دەڵێم پۆزش
نەبا کۆڵان و شەقام و درەختەکانی
بەر دەرگای دڵم سەرخۆش بن و
ناوی خۆمم بیرچێتەوە



## گەردیلەکانی جەستەم ئاشناتن

برینێکی بە پەنجەی ساتەکانمەوە
چرکە چرکە دەکولێیتەوە
جیاوازیت لەگەڵ ئەستێرە لەوەدایە
پرس بە شەو و ڕۆژ ناکەیت
هەموو دەم دەدرەوشێیتەوە
پەیتا پەیتا
ڕێژنە دەگریتە تێڕوانین و
چاوی خەواڵووی ئەم تەمەنە نامۆیەم
زۆر جار لە خۆم ڕادەمێنم
ئەو ساتانەی هەوری سپی نیگاکانت
نمە نمە هەموو جەستەم دەشواتەوە
ئیرەیی بەخۆم دەبەم کە تێم دەڕوانیت و
لێناگەڕێم کەسێک
تێبگات لە نهێنی گومڕاییم
سەیرە
کەسێک بم بە ویستی خۆم نەهاتبمە بوون
ئەی بۆ بە ویستی خۆم نەژیم
هەردەم بە سێبەری خەمێک دەچم
هێشتا لەدایک نەبووە
خەونەکانم بەرنامەکانی سبەینێم

بۆ دادەڕێژن ... و
هەر ئەوانیش بڕیار لەسەر چارەنووسم ئەدەن
تۆ لە وەرزەکانم دەرکەم
لە چوار وەرزەم
وەرزێک نامێنێ بە خەمباری
بۆ بروانمە ئاوێنە
ئەگەر سیمام لە گلێنەی چاوانت
بدرەوشێتەوە
با لە ئاوێنەی ڕوخسارت پایزی ڕەنگم ببینم
دەستێک نییە
لەو چوارچێوانەم ڕزگار کات
بەسەر ئایدیامدا سەپاوە
تا بتوانم هەر هیچ نەبێ
ڕێژنەی نیگایەکی کلۆڵت تێگرم
تیشک بارانم مەکە
ڕۆژێک دادێ
چوون بەفری ڕۆژێکی زستان
لەبەر تیشکی نیگایەکت دەتوێمەوە
ئەوساکە لە ئەلبوومی ئەندێشەتدا
جار نە جارێک پەڕەی کۆنی
بیرەوەرییەکان هەڵدەرەوە
تا ببینیت گەردیلەکانی جەستەشم
بەسەر چڵێکی درەختی خەیاڵتەوە
دەنیشنەوە و
ئاشناتن



## بمگێڕەوە سەردەمی بەر لە ئایدیا

بەهەشتم دی لە چاوانت
کە بەڕاگوزەر تێپەڕ بوویت
باڵندە ئاسا هەڵدەفڕیم
نازانم بۆ ڕێم کەوتە
ئەم بێشە جەنجاڵەوە
دەمێ لە ئامێزم دەگریت
هێندەی تر
رووحی گرینۆکم ساوا دەبێتەوە
بریا بتوانم کەسێک بم
کەسێک جگە لە کۆشی خەم
ئامێز بۆ چەند کەسێکی دی بگرێتەوە
دەمەوێ کەسێک بم کەسێک
لەودیوی بێدەنگیمەوە
دەنگم نەناسرێتەوە
کە خەم لە ژێی گیتاری دەنگمدا دەڕوێت
سەدای دەنگم
لە گوێچکەی ئەشکەوتەکانی بووندا
دەزرنگێتەوە
لەودیوی ماسکەکانەوە

ڕووم دەپۆشم و
لەودیوی هێڵەکانەوە تۆنەکان
تۆ پێم دەڵێی ئەو پێم دەڵێ
هەمووان پێکەوە دەڵێن
ئەو تۆنە نامۆ نییە
تێڕاماوم
دەنگمە یا گوێی بوونە دەزرنگێتەوە
بمگێڕەوە بۆ سەردەمێک
بەر لە ئایدیا لەدایک بێت
دەمەوێ ژنێک بم
ژنێک ژیان لە زەینیدا
جگە لە شۆرینی پیاڵەکان هیچی تر نییە
کەسێک
تاسەی پیاسەی
شەقامەکانی بێدەنگی نەکات
دەمەوێ کەسێک بم کەسێک
شوێن سێبەری خۆی نەکەوێ و
چیدی لەگەڵ خۆیدا نەدوێ
کەسێک بەگومانەوە
نەڕوانێتە یاساکانی بوون
کەسێک
دەس لە عیشقی نیگەرانی بەردات و
جگە لە گوارەیەکی چکۆلە



چەند بازنەیەک لەدەس کات و
خەناوکەش لە گەردن کات
بمگێڕەوە سەردەمی بەر لە خۆناسینم
دەمەوێ کەسێک بم
کەسێک لە ترسی گوناه
سەرپەنجەکانی سوور ناکات
نەک لەبەر سەرقاڵبوون بە خەم

## هەمیشە چاوم لە تۆیە

دەپرسن بۆ چاو دەبڕیتە ئاسمان؟
لەوێندەر عاشقێک هەیە
دوور لە گەمەی بەرژەوەندییەکان
تێمدەڕوانی ..
تیشک بارانم دەکات و
داوای ماچیشم لێ ناکات،
ئەو لە پەیامێکیا فەرمووی
تاکو ئێستا کەسێک وەکو تۆ لێم ناگا..و
بەو میهرەوە زیکری نەکردووم
هەمیشە بە تێڕوانینێک
چاوەکانم دائەکاتە لێزمەی باران .. و
نایگەمێ
هێشتاکە دایکم بەو چەشنە
سینگی سۆزی بۆ والآ نەکردووم
ئامێزێکی میهرەبانی بۆ نامۆییم نەگرتۆتەوە
دەبێ کێ بێت جگە لە تۆ
لە نهێنی ناخم بگا و
پێم بڵێ نوێژم لێت ناوێ
دەبێ چ ئەویندارێک بێت





بە چەشنی تۆ ..
لە عیشقا شەلاڵم بکا و
پێم بڵێت بێ خەم بنوو
ماچ و ئامێزم لێت ناوێ
ئیدی بۆچی لەم زەمینە سەمەرەیە
دە هێندەی تر گومڕا نەبم
کە عیشقی تۆم لە دڵدایە
بۆچی کڕنۆشت بۆ نەبەم
ئەو لە دڵی مندا دەژی و
من کە لە نێو دڵی ئەو دەنووم
بە چرپەوە پێم دەڵێت سەرپۆش فڕێدە
بمویستبا پرچەکەت بشاریتەوە
وەکو بەڕوو کڵاوم لەسەر دەکردی
دەمێ دەمڕوانییە ئاسمان
هاوڕێکانم بە تەوسەوە تێیان دەڕوانیم،
بە ئاخافتنەکانمیان دەگوت فەلسەفە و
بە گومڕا ناویان دەبردم
نەیاندەزانی عاشقم و (ئەو)
لەناو دڵمدا دەژی

# پێڕست